| | | |
|---|---|---|
| ناوی کتێب | : | ئه سرینی ئاڵ |
| نووسینی | : | عومەرساڵحی ساحێب |
| چاپی | : | یەکەم / ۱۳۷۲ |
| تایپ | : | مرکز کامپیوتر کردستان |
| تابلۆی بەرگ | : | هونەرمەند هادی زیائەدینی |
| تیراژ | : | ۳۰۰۰ |

لیتۆگرافی و چاپخانەی چیهر تەوریز

له چاپدانەوەی بە دەست خاوەنیەتی

ژمارەی ئیزنی چاپ و نەشر ۳۹۷۲۸ - ۱۳۴ / ۷۱/۹/۴

# پێڕست

پێشکەش بەوانەی، کە کۆمەکی ماڵی و مەعنوی ئەوان فریام کەوتن
پێشکەش بەو قوتابیانە کە هەرگیز لە بیرم ناچنەوە
پێشکەش بەو براو خوشکە بە ئەمەگانەم کە لە خوێندنە وەو، نوسین بە زمانی خۆیان حاشا ناکەن و، گەشەو نەشەدان بە فەرهەنگی خۆماڵی بە ئەرکی سەرشان دەزانن
بی گومان ئەو خوایە کە کوردی بەدی هێناوە زمانێکیشی پێداوە. کە وابو نە زڕی لە خۆیەتی و نە لە زمانە کەی.

«کۆلیل»

# سەرەتا

گوڵستانی سعدی شوێنەوارێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئەخلاقی‌یە و بۆ بەرزی پلەی ئەم وێنەوارە و بەس کە، کەڵە شاعیران و نوسەرانیّ وەك، «جامی»، «قاآنی»، «قائم مقام اِهانی «لە خێڵی لاسایی کەرانی گوڵستانن. پەخشانی گوڵستان لە سەر شێوەی «مُسَجَّع» ە و وەندی خۆی لە گەڵ شیعر بە تەواوی هەڵنەبڕیوە.

ۆیا گولوستان و بوستان کراونەتە کوردی هەرچەند چاوم بەم وەرگێڕدراوە بە نرخانە کەوتوە بەلاّم بیّ‌شك دەبیّ وەرگێڕانی «بوستان» پتر سەرکەوتبیّ تا کوگوڵستان. بەڵگەی ئەم یەش دوشتە، یە کەم، ئاهەنگی تایبەتی پەخشانە کەیە لە شێوەی موسەجەعدا. و دوهەم ێوازی سەعدییە لە دامەزراندنی باسێکی قوڵ لە رستەیە کی کورت‌دا دیارە وەرگێڕانی رهەمێکی ئەوتۆ چەتونترە لە بەرهەمێکی شیعری. چونکە شیعر قاڵب و ئاهەنگێکی دیاری راوی هەیە وبە دۆزینەوەی ئەم قاڵب و ئاهەنگە شاعیر دەتوانیّ لە سەر هەمان شێوە بڕوا لاّم لە چەشنە پەخشانی باسکراو دا ئاهەنگ و قاڵب تایبەتن بۆ دەقی ئەسڵی. بۆ وێنە لە وڵستان داهاتوە، «خبری دانی کە دلی بیازارد تو خاموش تا دیگری بیارد «ئەم هونەرە کە ڕەدا بە کار چوە چەند لایەنە یە. هونەرێك، مانا وکاکڵی قسە کە. هونەرێك، فراوانی مانا و سکی رستە. و هونەرێکی تر ئاهەنگ و هەوای پەخشانە کە. وەرگێڕانی ئەم دێڕە، ئە گەرچی ستی ئێمە،وە خەزێنەی بابیداری یەك عومر ئەزمونی گەورە پیاوێک رادە گەیەنیّ، بەلاّم رچی بێ تەواوی ئەم هونەرانە ناگرێتەوە. کەوایە لە وەرگێڕانی گوڵستان‌دا ئێمە تەنیا لە نای قسە و پەندە کانی سەعدی کەڵك وەردە گرین و لە تام و چێژی لایەنە هونەرییە کانی تری م شاکارە بیّ بەش دەمێنینەوە، کە هەڵبەت ئەو کەڵکەی وەری دە گرین خۆی کەم نیە.

مۆستا مەلا عومەری ساڵحی دیارە ئاگادارییە کی باشی بە سەر ئەم مەبەستانەوە هەبوە و ئەم یەنانەی بە تەواوی دەرك کردوە، هەر بۆیە خۆی لە قەرەی پەخشانە کە نەداوە و نەیویستوە وڵستانە کە هەر بە گوڵستان وەرگێڕێتەوە. هەربۆیە زۆر وەستایانە و وشیارانە بۆ ئەوەی باری

هونەری مەبەستەکە کز نەبێتەوە، کارەکەی خۆی بە شیعر دەست پێ کردوە، تاکو ئەدەبی کوردەواری جگە لە وە دەست هێنانی بیر و بەرژەوەند و ئەزمونەکانی سەعدی، لە شیعرێکی پاراو و رەوانیش بەهرەمەند بێ. ئەوەی لە کارەکەی مامۆستا دا پتر جێی سرنجە ئەوەیە کە، لە وەرگێڕانەکەیدا شێوەیەکی تایبەت وکەم وێنەی گرتوە، کە ئێمە دەتوانین لەم شێوە وەرگێڕانە لە جێی خۆی بۆ هەندێ بەرهەمی تریش کەڵك وەرگرین ئەویش ئەوەیە، سەعدی کە بە فارسی دواوە و بە فارسی نوسیوە، بە فارسیش بیری کردوەتەوە، بەڵام مامۆستا، کە لە ژێر تەئسیری بەرهەمێکی بە هێزی فارسی‌دا بوە، بیری کوردی خۆی نەدۆڕاندوە و هەر بە کوردی بیری کردوەتەوە. بە واتای رونتر، سەعدییەکی کە لە شیراز هەستاوە، عەرەبستان و شام و میسر و مەراکیش و هیندی پشکنیوە، وا دەزانی لە جزیر و بۆتان لە دایك‌بوە و بانە و سابلاخ و سلێمانی و هەولێر وکۆگەزاوە، بۆیە لە گەڵ زانایەکی سنەیی داخێوێ، لە کورد وگۆران دەدوێ، گۆزە و دێزەی کوردستانی خۆمان بە نمونە دەگرێ و بۆ زۆر مەبەست پشت‌بە مەتەڵی کوردی دەبەستێ. کاکڵی قسەی سەعدی لە سەر ئەم شێوازە، جوانتر دەچەسپێ و باشتر لە دڵی خوێندەواری کوردا جێ دەکاتەوە، چونکە لێرەدا لایەنەکانی تری هونەری سەعدیمان وەلاناوە و مەبەستمان مانا وبەرهەمی قسەکانە. ئەمە لە کاری وەرگێڕان‌دا شێوەیەکی جوان و کەم وێنەیە بەڵام وەك پێشتر باسی کرا لە جێی خۆی نەبێ ئەم شێوە وەرگێڕانە رەوا نییە.

ئێستا- کە چاوێکمان بە سەر ژیانی سەعدی دا خشاند و بە کورتی ئیشارەیەکیشمان بۆ گوڵستان و وەرگێڕانە کوردییەکە کرد، جێی خۆیەتی بزانین «مامۆستا مەلا عومەری ساڵحی» کێیە؟

شاعیر، کوڕی محەممەد سادق، کوڕی خوالێخۆشبو «میرزا ساڵحی ساحێب» ە، لە ساڵی ١٣٢٢ ی هەتاوی لە ئاوایی «دایە سلێمان» ی سەر بە شاری سەقز لە دایك بوە. لە تەمەنی پێنج ساڵی دا لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کرد. پاشان وەکی هەمو فەقێیەك ماڵی خۆیانی جێ هێشت و لەم دێ بۆ ئەو دێ و لەم حوجرە بۆ حوجرەیەکی تر کەوتە رێ و لە خزمەت

مـامۆستایانی بـە نـاو بـانگی کوردستـان، وەك: «مـامۆستامەلاعبداللـە مـحەممەدی» ئیمـام جومعەی شاری سەقز «مامۆستامەلا ئەحمەدی نمەشیری، «مامۆستامەلا حەسەنی ئـەدیبی» «مامۆستا مەلا محەممەدی شێخەلئیسلامی، «مامۆستامەلا شێخ حوسێن خان» و «مامۆستامەلا کامیلی نەقشبەندی» خوێندنی گەیاندە کتێبی «جمع‌الجوامع» و لە ئاوایی باخچەڵەی ناوچەی دیواندەرە بوبە مەلا. ساڵی ۱۳۵۷ دەستی لە مەلایەتی هەڵگرت و بە کاری «معلم» ی خزمەتی بە کەڵکی خۆی درێژە پێدا.

لە ساڵی ۱۳٤۲ەوە دەستی داوەتە شیعر و بە کوردی و فارسی و عەڕەبی شێعری هەیە. نازناوی شێعری، «کۆلیل»ە.

لە ساڵی ۱۳٦۳ هەوەڵ بەرهەمی شیعری لێ چاپکرا بە ناوی «لە هەر چیمەنێ دیمەنێ» و لە ساڵی ۱۳٦٦ «گوڵی خوێناوی» بلاّو کرایەوە. لە ساڵی ۱۳٦۷ کۆمەڵە دوبەیتییەکانی لە لایەن نوسەری ئەم پێشەکییەوە کۆکرایەوە و چاپکرا. وە لە زۆربەی گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکانی ناوخۆ و دەرەوەش دا شیعری بلاّو کراوەتەوە.

سەیید عەبدوڵڵای سەمەدی

مەهاباد - ۱۳٦۸

# بیروڕای مامۆستا حەقیقی سەبارەت بە ئەسرینی ئاڵ

کــۆلیل مــامۆستای فــەرزانــە و زانــا
وەســتــای جینــاسان زانــا لە مــانا
کــۆلیلی وردی هــێزای کــوردی نــوس
ڕۆڵــەی نــە دیــاری دەست و قــەڵەم لوس
غــەواســی دەریــای گــەوهەر شنــاسی
ئــەلحەق وەلئینســاف ئــەدیبێ خــاسی
ئــەسرینی ئــاڵم تەمــاشا کــردن
بــە واژە بــەرزن بــە مــانا وردن
شــاری ئــەوینم کــردە نــمونە
مشــتێ لە خــەروار لەبــەر ئــەزمونە
کــێ دیــوانــدەرەی نــەزانــی کــوێیە
هــەر کــە خــوێندییەوە خــەڵکی ئــەوێیە
بــیری وردی تــۆ لەو مــەزرا شــینە
خشــڵی بــەر مــوری بــوکی ئــەوینە
وات رازانــدەوە بــاغات و چــیمەن
بــاغی شــەددادی راغــە بــۆ دیــمەن
ڕەنگ و روت هێنــا بــۆ دەشت و گــوڵزار
وەك هــەوری نیســان بــۆ مــانگی ئەیــار
خــێر و خــۆشی دی کــەژ و کــێو و چــێو
بــە هــەڵبەستی تــۆ زێــڕی ســاحێب نــێو

هـــەوارە بـــەرزە و بـــاخی خـــوارەوە
خـــونچەی پشکـــوتون بـــە دەم نـــارەوە
گـــوڵبەن گـــولزاری لەعـــلە و بیجـــادە
ســـاتێ بـــۆ دیـــنی لە جـــادە لادە
بـــاغ بـــاوە حـــاجی و ئـــاسیا و حـــەف بـــرا
گوڵیـــان دەپشکـــون وێـــنەی چـــل چـــرا
ئـــاوی هـــەڵدێری بێســـانە جـــاڕی
بـــە هـــاژەهاژی بـــەردی دەهـــاژی
هـــەر ســـەرکەوتوبی مـــامۆستای ئـــەدیب
لەبـــیبی بـــێ نـــاو هـــەر وەکـــو غـــەریب
ئـــەتۆ ســـاڵحی دۆســـتی حـــەقێقی
تەمـــای دۆعـــاتم بـــە هـــۆی رەفـــێقی

بۆکان عەبباسی حەقێقی یـازدە

رەشەمەی ـ ١٣٦٤

# خوایە بە ناوت

خــوایــه بــه نــاوت دێــته وتــووێژ
مــنێکی عــاسی و دێــوانــه و ســەرگێژ
چــون پــرچــی هــەرچــی شیعر و پەخشانه
هــەر بــه شــانەی تــۆ درا لە شــانه
ئــەی نــزیك لە مــن، مــن لە تــۆ دورم
بــۆیه تــاریك و،کــوێرو، بــێ نــورم
تــۆکــان کــەرەم مــن کــەڕەم لەکــان
دەکــەم، ئــەی خــاوەن مــایکون وکــان
ئــەوەی خــۆت ئــەهلی بــەوەی، بیکه پێم
تــۆ وەك مــن مــەکــه تۆکێیت و من کێم
مــن کــورتم هێنــا لە خــزمەت کــردن
تــۆ کۆتــا هــاتی لە تــۆڵە گــردن
تــۆ ئیحســانەکــەی مــن تــاوانــەکــەم
فــەرقی مــن و تــۆ چــین؟! تــاوانــەکــەم
مــن «کــۆلیل»ەکــەی دیلی نەفسی خــۆم
نــەخۆشم، تەمــای شفــای لوتــفی تــۆم
سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٣ هەتاوی

# بەهانەی بون

گزینگی هەتاو دای لە زوڵفی شەو ڕوژ بەشەو هەڵات
بزەی شەو بونی ڕاپەڕان لەخەو پەژارەی هەڵات
ناسکتر لەڕوی خەیاڵی جوانی نەسیمێ بزوت
کەشنەی سروەی بەری بەیانی بەیادی پشکوت
هەستی ڕومەتی کوتا بە خاڵی کەبێئە وخاڵە
لیباسی بونی لەبەر ناکاڵێ نەگەیوە کاڵە
دوشەمە شەوێ لەکاتی بەیان لە ئاسۆی ئەمەل
وریشەی گرشەی بە عالەمگەیان ئەستێرەی ئەزەل
ئارەقی شەرمی دەرونم لەچاو بۆیە ئاژینە
کە لەوەسفی دا منێ ناتەواو دەکا ورینە[1]
بە وردی هیوای چاوێ چاوەڕوان ئاواتە خوازم
وەری بگرێلێم وەکودیاریشوان شای سەرفەرازم
ئەزانم کەئەوگیانی گەردونە بەهانەی[2] بونە
منێ بەم هەمو بەها نەبونە بەهانە بونە[3]
ئەدوم لەباسی بەرزیشانی ئەوگرۆی ئەوینە
بەشاهی ذنی دەنا شانی ئەو مۆری یەقینە
شەپۆلی بەحری خەیاڵمباڵی ورد و شکاوە
ڕێگەی سەرنجی دولێوی ئاڵی لێ شلێژاوە

---

١ - وتو ویژ بەدەم خەوەوە وتووێژی بێ‌ڕەبط بەهۆی نەخۆشینەوە
٢ - واتە هوێ بە دیهاتنی عالەمە
٣ - پەڵپو بیانو

لەکـــورتی تـــەشییە لەرزم‌تـــی‌ئەچێ گـــەربڵێم هەتـــاو
لەهـــەنیەی ئـــەچێ هـــاتو کـــەنەچێ چـــی‌بدەم جـــواو
ئـــەڕژێتە نـــێولەش مـــوچڕکی تـــەزین بـــەرێژنەی[1] بەهـــار
تـــائەڵێم هـــیلال وەک ئـــەبرۆی نـــەبین دەکـــەم اِستغفـــار
وەختی‌لەترســـا هـــیلال بـــەشەستی بـــوبە دولەتـــۆ
لەدوای ئـــافەرین لەشـــەستی دەســـتی کـــوتی دولەتـــۆ
ئـــەڵێن وەکـــومن کـــەمەگۆچـــانێ وەکبـــرۆی تـــۆیە
بـــەزەبری دەســـتت لەت بونم‌یـــانێ دەک لەم درۆیـــە
کەسێ کەڕەمزی هاتو چۆی هەست و هەوەڵ نوختە بێ
گـــەلاڵەی هـــەبون بەئەو پابەست‌و بەئەو پـــوختە بێ
مانگی یەک شەوە هەرچەندە شەنگە دڵ دوی ئەکەوێ
ئـــالەو تـــەشیەگـــەلی‌دڵ تـــەنگە ئەهـــادوای شـــەوێ
لەشێوەی جـــوانـــی هـــەوەڵ نـــامێنێ هـــەر ســـاتێ جـــۆرێ
ســـەرگۆنـــاکـــانی هـــەل ئـــەقرچێنێ بـــە تـــیشکی خـــۆرێ
غـــونچە بـــوبەگـــوڵ گـــۆیـــا وەک زاری دەمـــی‌کردەوە
هات ە بینێتەیەک چون هەوەڵ جـــاری ڕیـــێ نـــەبردەوە
ئـــەوندەی تـــاڤگە و قـــەڵبەزە زۆرن ڕونـــاکـــو ڕەوان
هـــەموی لەخـــوانـــی ئـــەوموچە خـــۆرن بـــۆیە بـــاسە خـــان
ڕەوتـــی بـــای‌شەماڵ شـــەلو جێمـــاوە لەحەنـــای[2] عەتـــای
بـــارانـــی بەهـــار تـــنۆکـــێ ئـــاوە لەدیـــاری سەفـــای

١ - بارانی تون و بەهێز.
٢ - لەحاستی

لەتــاسەی خــاڵی وشــە بزرکــا[١] لێــزمەی هــونراوە
وێرای[٢] وەنـەبێ ێیخەی خـۆی شرکـا چـارەی نەمـاوە
بــاڵای ئــاوێنەی ئــایین و یــەقین تــەوەژمی[٣] ژیــنە
پــرشنگی نــورە لەئــاسۆی ئــەوین سنوری دیــنە
لەوەسـفی مویــا، ســەرگێژ و مــەنگم ڕێگــە بــاریکە
چــاوی نــابینێ قســەی دڵتــەنگم شــەوە تــاریکە
حەیــا لەحەیــای حەیــای تکــیوە بــەرگی گوڵبــاخی
لەتــاوی کــوڵمی ڕەنگــی پــەڕیوە لەبــاخ لەشــاخی
لەلای نــــەفەسی بـــۆنی گـــوڵاڵان بـــۆنی هــەڵاڵە
بــەیبون و چــنور لەپــای کوســاڵان[٤] یــاخۆ هــەڵاڵە
یەک هەناسەی ئەو لەناو پۆلی‌گوڵ عەتری دا بەگشت
لەکەند[٥] و لەند و لەسەر شاخی چڵ لەبەرو لە پشت
نــەخۆینەوارێ بــوبە دژمــنی نــەخۆینە واری
سوتــا نــەزانــین، خــویو قــوژ بــنی، چــونە مــەزاری[٦]
نــورێ لەمــەککــە کــەوتە بــریقە کــە بــەلەبورە[٧]
زانــینی بــەشەر دای لەتــریقە بــە هــۆی ئــەونورە

---

١ ـ پڕوسقیا
٢ ـ غەیری ـ مەگەر ئەوە نەبێ
٣ ـ گەرمای لەسەرخۆ
٤ ـ کوێستانێ‌کە، کێوی زۆری بیێ
٥ ـ کەند و لەند یانی بەرزو نزم
٦ ـ گۆڕ ـ قەبر
٧ ـ بەرلە هەمو شتێ

دوکـــانی وتـــو وێـــژی ئەدیـــان قـــوفڵی لێـــدرا
کـــە ڕۆژی ڕونـــی ئـــایاتی قورئـــان بـــۆئە و هـــەڵکرا
تـــا ڕۆژێ زەوی ئـــەسورێتەوە، زانـــین ســـەرکەوێ
گـــەل ڕیگـــەی ئـــامانج بـــدوزێتەوە هـــەروابـــەرکەوێ
هێشتـــا پـــرشنگی دڵـــۆپێکە چـــوک لەو بەحرە گەورە
خۆی تیا ئەشواتۆ سەوزەی ڕەزاسوک دورە بەدەورە
هـــەققە کەعیســـابەفوێ لەلەش زیـــندوی ئـــەکـــردۆ
آحـــمد کەڕۆحی نەکردایەگەش ڕۆحیش ئەمردۆ
موســـابەعاسای ئـــەونیلی وێســـان هەتـــا تـــێپەڕ بـــون
خوا بۆخـــاترئەو فیرعەونی خنکـــان بۆ جەحانم چـــون
ئـــەو ئـــەبێ بـــێ کـــەوش پـــێ بنێ لەتور ئەم تاعاسمان
هەر بەکـــە وشـــەوە ئـــەچێ بۆحوزور بۆلاّی لامـــەکـــان
مشـــتی داوەشـــان دای لەدەمـــی زۆر واتـــە یـــەکسانە
مـــرۆڤی ســـورو ســـپی و ڕەش وبـــۆر هـــەموی ئینســـانە
یـــاسای ئـــازادی بـــوبە یـــاساوڵ بـــردی هـــاشاوڵ[١]
بـــۆ خـــۆپەرستی، چـــاوی چەپـــاوڵ نریـــاپوکاوڵ[٢]
فەغفوری چینی و خوسرەوی پەروێز هێرکۆلی ڕۆمـــی
بـــە وسکـــوتێکی لێـــان بـــراهـــێز لەهـــەرسێ قۆمی
لاتو چەقۆکێش خۆی خستەپەسێو لاتـــەی کـــردە لات[٣]
نەهـــاتی نەمـــا تـــاپای هـــاتەنێو نـــۆبەگـــەییە هـــات

---

١ - هەڵمەت پەلامار
٢ - قامک بە ناوچاو چەقاندن
٣ - ناوی بێتکە کە موشریکەکان لەزەمانی پێغەمبەردا(ص) دەیان پەرست

شکـاندی پشـتو سـینگی نـاحەزی،یەکـیەتی هـاورد
لەگیانی ئەوس و خەزرەج[1] دابەزی کـینە، دیقی کـرد
«کۆلیل»ی هەژار کـەسیرەی کـەسەر هـەرئەوە هـیوای
لەو ڕۆژەی کە سەر شۆڕە لەمـە حشـەر لەتـاوی گونـای
بە پاکی و چاکی چاکـی کـە وای گـوڵ وە،مـاشاءاللّـه
پەیـــامی درودلەمـــە ڵـبەندی دڵ بـــۆ رســـول الله
هـەروا بـۆگیـانی بـەرزی یـارانـی خـەزورو زاوای
بـوبکر و عـمر و عـلی و عوسمـانی بـاقی بـە رو دوای
سەقز - ٢٥ سەرماوەزی ١٣٦٤ بە بونەی ساڵ ڕۆژی
لەدایک بونی پێغەمبەری مەزنەوە - درودی خـوای
ڵی بێت

---

١ - ئە و س و خەزرەج دو تایفە بون کەزیاتر لە سەد ساڵ دژمنی و کوشتو کوشتاریان لەگەڵ یەکتر بیا بو پێغەمبەری مەزن (ص) ئاشتی خستە نیوان یان وەبون بە برای یەکتری.

## هەرچەن

هەرچەن گیان گەیشت بە نوکی لوتم

لە ناو زستانی خەفەتا ڕوتم

هەرچەن خەمینە دڵ لە دەستی چەرخ

لە هۆشیاری خۆی لەبەدمەستی چەرخ

هەرچەن دو باڵی پەپولەی مەیلم

سوتا بە چرای جەماڵی لەیلم

هەرچەن لە گوڵزار باس و بەیانا

گوڵی زەوقەکەم چو بە تاڵانا

هەرچەن پیاڵەی شەڕاوی کەیفم

خواردیەوە ڕەقیب درێغ و حەیفم

هەرچەن سەرخۆشی خەفەت و خەمم

لە شەوە زەنگی ژینا بێ شەمم

هەرچەن کسپەی خەم گگیانم وەك مۆم

تاوانۆ بە تاو ئاهو ناڵەی خۆم

هەرچەن سەرتاپای شعورم سڕە

تان و پۆی ڕەگی حەنجەرەم گڕە

هەرچەن دڵسەردم وەك بەفری سەرکەل

تاوسی جوانیم نەیما پەڕ و پەل

هەرچەن کە تارای بوکی باسەکەم

ڕەشی پۆشیوە وەك هەناسەکەم

هەرچەن سەرتاپای لیباس و لەشم
گوڵدۆزی کریا بە خوێنی گەشم
هەرچەن ئەلەرزم بە دەم لەرزەوە
وەك قەرزار بەدەس خاوەن قەرزەوە
هەرچەن ڕەنگ لە ڕوی بەختم پەڕیوە
سەگی نەگبەتی لە ڕوم وەڕیوە
هەرچەن ئاوێنەی تەبعم نانوێنێ
بولبول لە باخی گولم ناخوێنێ
هەرچەن ئاوێنەی ئەسرینی ئاڵم
ئەنوێنێ ڕەنگی بەختی ڕوتاڵم
هەرچەن گەوهەری ئەسرینی ئاڵم
کەمتر دێ لەچاو، تەنیا و بێ باڵم
هەرچەن لە دەشتی چوڵی بێکەسی
گیانی بێ تینم هیچێ نەحەسی
هەرچەن گەردەلول سارای دەرونم
کوێری کرد چاوی گیانی زەبونم
هەرچەن لە بەزمی یارانا دورم
بە تێخی هیجران سەرتاپا سورم
هەرچەن گیان و دڵ نیمە سوتاون
سوختی تەنوری دەرد و زوخاون
هەرچەن ڕەوژەوەی ژیانم ژانە
سندوقی ماڵی دڵم خەمدانە

هەرچەن لە باخی ژیان و ژینا
زەمانەی زاڵم لێم کەوتە قینا
هەرچەن خەیاڵم پرژ و بڵاوە
ئەڵێی کە مێشکم بۆمبا لێ داوە
هەرچەن زەمانە دورانی لێوم
بەڵێنم دابو لێوم نەبزێوم
هەرچەن درێژە شەو رەشی بەختم
چاوکوێر بوی دوکەڵ هەناسەی سەختم
هەرچەن بە جوانی خەم پیری کردم
زۆری موی چەرموی لێ هەڵهاوردم
هەرچەن رو سوری چەپلاخەی دەردم
دڵ وەك زستانی چل چەمەی سەردم
هەرچەن وەك لالە دڵ پڕ لە خوێنم
دو ئەژنۆ نەبێ کەسێ نادوێنم
هەرچەن هەلاڵەی هەنگم کەم رەنگە
سیس و ژاکاوە، کز و دڵتەنگە
هەرچەن ژەنیالێم دەرکی وەسڵی لەیل
دڵ بێ مەیلی شەوق وەلێ لەخەم کەیل
هەرچەن بوبە ژن کیژی بەهارم
ئاوسی کۆرپەی دەرد و ئازارم
هەرچەن ئەقڵ و هۆش کپ وکەزمی کرد
بێ هێز و بێ فەڕ لەڕ وگەزمی کرد

هەرچەن دل لە نێو قەفەسەی سینە
وەکو ئازیەتبار سەرتاپای شینە
هەرچەن کە تەپڵی ڕسوایيم ژەنیا
لە ماڵی خەما وێڵم بە تەنیا
هەرچەن ڕو زەردم وەك زەردی خەزان
بای ناموڕادی خەم، دڵمی تەزان
هەرچەن وشكۆ بوم وەك پوشی هاوین
سەبون و گڕەی گەرما لێی داوین
هەرچەن چەپۆك و چەپلاّخەی زوخاو
چەپۆکانە کەن لە جەرگی روخاو
بە سەر ئەم گزوخ زامان کاری
خۆم لە دەس نەدا تەواو یەکجاری
تین و ئەوینی شێعر و هەڵبەستم
جار جار سەر ئەدەن لە ماڵی هەستم
وەلێ مەمنونم لە فرمێسکی گەش
بوبە چرای ژینم لە شەوگاری ڕەش
لە سەر مژۆڵم وەك گلۆپ هەڵبون
تاریکە شەویان کردە ڕۆژی رون
بون بە کۆمەکی لەشی بێ تینم
هیوایان خستە گیانی ئەوینم
وا لە بەر چرای ڕومەتی ئەسرین
کردم ئاودێری هەلاڵە و نەسرین

بــە خــوێنی دڵ و بــە گــەوهەری چــاو
تــوانــیم چــەپکێ گــوڵ خــۆشڕەنگ و تــێراو
بــە ڕەنگ و بــۆنی ئــەوین و ئــایین
بــۆ بــرا و خــوشکی کــوردم بکــەم شــین
وەکــو گــرشەی خــۆر پــڕشنگی هــەیە
جــوانــی رومــەتی چــون ئــەستێرەیە
بــەژنی جێژنــانە و مــەبەستی ژیــنە
هــۆی بــوژانــەوەی مــێشکی بــێ تــینە
بــە بــەژن و نمــا هــەر چــڵێ چمــا،
دەمــی هــا لە نــاو دەمــی شــەونما
چــونکە گوڵستــان بــایی هــەشتەمێن
بــۆ هــەڵبەستەکــەم ئــامیانە و هــەوێن
بــوکێ کــە دەرچــێ لە ئــەو بــاوانــە
دیــارە ســەراپــا بــێ عــەیب و جــوانــە
لە هــاوەڵان و یــارانــی گیــانی
لە تــۆ کــە رۆڵــەی لاوی کــوردانــی
ڕێگــەت گــەرکــەوتە ئــەم بــاخە جــارێ
کــارێ بکــە بــۆم، یــا مــەکــە کــارێ
هــەوەڵ تکــایە نــاحەزەکــانی
بــێنە ســەر ڕێگــا و دیــمەنی جــوانــی
ئــەگــەر ئــەم کــارەش لە دەســتت نــایە
عــەیب و عــار پــۆشین کــارێ ڕەوایــە

مـــەردم، کـــە مـــردم، ئـــاوا بـــوم لە کـــەل
تکیـــامە ژێـــر خـــاك وەك قـــەترەی ئـــەمەل
بـــە دۆعـــایێ خـــێر بـــفەرمون یـــادم
شـــایەت دۆعـــاتان بگـــا بـــە دادم
لە مـــێژە «کـــۆلیل» چـــاوەڕێی خـــێرە
چـــون دەمـــێکە شـــەڕ بـــە گیـــانی فـــێرە

# ناڵینی دڵم

کـــەسێ کــە دو گــوێی بــیستنی کــەڕە
نــەگــبەت گــرتویە عــاقیبەت شــەڕە
چــون لە بــازاڕی قــاڵ و بــەڵادا
خــۆی کــەڕکــردوە ئــێستەش گــوێ نــادا
کــەسێکیش کــە وا کــەمەندی ئــیخلاس
لە گیــانی ئــاڵاو لە پــایە و ئەســاس
چبکــاکــە نــەزواو، نــەچێ بــۆ حــوزور؟
یــا وەك قــورسی خــۆر خـۆی نـەگـرێ لەنـور
ئــەوانــە خــۆری شــەوی تــاریکن
شــارەزای راز و رێگــەی بــاریکن
شــەمی خــۆشبەختی بــۆ هــەڵکراون
بــە واتــەی کــوردی خــودا پــێداون
خــوایــە ئــاوات و نــاڵینی دڵــم
دامــاوی رۆژی ژێــر بــەرد و گــڵم
لە کــێ داوا کــەم مــنێکی بــێکەس
کــەلە تــۆ بــانتر نــیە بــاڵا دەس
شەقــامێ کــەتۆ دەس نیشــانی کــەی
کــوێری نــاکــاتۆ زۆری جــەمو کــەی
کــەسێ تــۆ رێگــەت نــا بــێتە بــەری
لەزێــی لانــادات هــەزار مــوشتەری

تۆ رێگە نیشان نەدەیتە کەسێ
خۆی نایدۆزێتۆ بە هیچ مەبەسێ
تۆ ئەگەر عومەر نەخەیتە سەر رێ
چۆن ئەم ماڵی چو،ئەویشی دەچێ

## ئاقیبەت خێر

بێ ماڵ و مڵکێ ئاقیبەت خێر بێ
تاقە بە گەنجی قەناعەت تێر بێ
چاترە لە میری ئاقیبەت شەڕێ
گش کەسێ لە شوێن سەری بگەڕێ
خۆشی لە دوای شەڕ جوانتر ئەکاڵێ
تا بەزمێ بزێت بە کۆرپە تاڵێ

## بەختیار و بێ بەخت

وتیان بە پیاوێ ئاقڵ و تێبین
کامەڕووا کێیە لە ڕوی سەرزمین؟
فەرموی ئەو کەسەی کێڵاێ و خواردی
بۆخۆی و بۆگەل بە گەرمی ناردی

ئــەوە خـــۆشبەختە لە دنیــا و دیـــنا
هـــەوەڵ فـــێرخـــوازە لە دەرســـی ژیـــنا
وتیـــان ئـــەی بـــێ بـــەخت کـــامەیە وکـــێیە
پـــێڵاوی رۆژی رەشـــی لە پـــێیە
فـــەرموی هـــەرکەسێ بـــە دڵ بـــیکێڵێ
هـــیچی لـــی نـــەخوا و بـــمرێ و جـــێی بـــێڵێ
مـــەگـــەر نـــازانـــی مـــاڵ بـــۆ خـــواردنـــە
بـــۆ هەتـــا مـــردن پـــێ رابـــواردنـــە؟!
بـــە مـــەتەڵ ئـــەڵێن مـــاڵی خـــۆنە خـــۆر
دوایـــی ئـــەیێتە کـــەیفی چـــەکـــمە بـــۆر
ئـــەوجۆرە شـــەخسە بـــێ خـــێر و شـــوێنە
وەخـــتێ کـــە بـــمرێ پـــاداشـــی جـــوێنە
مـــاڵ بـــۆ جـــوا مـــێری و ســـوکی ژیـــانە
کـــەی تـــەمەن بـــۆ مـــاڵ بـــە دەس هێنـــانە
چـــەنێکی فـــەرمو موســـا بـــە قـــازۆن
گـــوێی نـــەدا بـــیستت چـــۆن بـــو ســـەر نگـــون
خـــوا بـــە تـــۆی داوە تـــۆش بـــیدەرە خـــەڵک
بـــۆ مـــردن چـــاکـــە مـــرۆڤی بـــێ کـــەڵک
کـــەسێ مـــاڵ نـــەکـــات بـــە زەخـــیرەی رێ
ئـــاقیبەت بـــۆ مـــاڵ ســـەری تیـــا ئـــەچێ
لە هـــەردو دنیـــا کـــاتێ خـــۆشبەختی
خـــەڵکی خـــەلاس کـــەی لە رۆژی ســـەختی

پـێت خـۆشە هـەردو دنیـا ت لە گـەڵ بـێ
خەرمـانی خـۆر بـەو بـۆ هـەژار هـل بێ
هـەرکەس نـانی خـۆی هـالە بـەر شـاڵی
خۆیـا، هـەر ئـەمەت پـێدەکـا حـاڵی
کـاتێ کـە بـەخشیت هـیچی لێ مـەڵێ
نـەکـو خـێرەکـەی لە دەسـتت هـەڵێ
وەکـو کشت و کـاڵ بـە تـەرزە و لافـاو
لە ریشـە دەردێ بـە مـلی شکـاو
بـەرهەمی بـەخشین بـە خـوتە و بـۆلە
یـا کـۆڵانەوە دەبـێ بـە کـۆلە
داری جـوامـێریت لە هـەرکوێ چەقـان
لق و پـۆی تـێپەرئەوێ لە عـاسمان
دەرخـتی بـەخشین هـەڵچێ لە هـەرجـێ
سـەردە سـوێتە عـەرش بـە لام بـە مـەرجـێ
قـوڵ هـەڵ نەمـاڵی و بـە تـەوری مـنەت
جـەرگی دارە کـەت بکـەی لەت و پـەت
خـۆت هـەڵمە کـێشە بـا ئـەو، بـالاکـا
تـابـەسـەر ، خـێرویێرائـالاکـا
بـۆ بـەر و مـیوەی ئـەگـەر بـە هـیوای
بـە کـۆڵانەوە مـەنیشە لە سـای
بـلێ ئـەی خـودای گـەورە زۆر سپـاس
کەیـاریمت دا بـۆ کـارێکی خـاس

لە خۆدەرمەچۆ کاتی هاویاری
دەرکە وەلە خۆ، بە خزمە تکاری
عومەر بۆ سەعدی سڵاو بنێرە
چون پێشانتی دا ئەم ڕێگە خێرە

## هەوڵی بێ سوچ

برای بەڕێزم لەم دنیا دوکەس
تەمەنیان دۆڕان بە فیڕۆ، عەبەس
هەوەڵ ئەوکەسە کۆی کرد و نەیخوارد
ئەمرێ و جێی تێڵێ بە هەناسەی سارد
دوهەم ئەوکەسەی ئەیزانی و نەیکرد
وجاخی کوێرە ئەوەش وەختێ مرد
زۆرێ شک ئەبەم خاوەن بیر و ژیر
با ئەو حاڵیشە گێژە و گۆشە گیر
سینەی گەنجینەی فکر و زانینە
کەچی وەک سەهۆڵ سارد و بێ تینە
هەرچەن خاوەنی کتێوەو، قەڵەم
پێنوس بە دەستە و لێنوس لەبەر دەم
بە هیچ کلۆجێ هەڵمەتێ نادا
لە ڕێگەی گەل و خەڵکی خودا دا

کەسێ بەم جۆرە بێ خێروێر بێ
کە مردیش ئەبێ وجاخی کوێر بێ
ڕەنگە خۆی بڵێ کوڕم لە شوێنە
وەلێ بڕێ کوڕ هۆی تانە و جوێنە
قەت وجاخ کوێری بە ڕۆڵە نییە
ڕۆڵە جارجارێ هۆی چاوکوێرییە
بەرهەمی زانین لە هەر بارێکۆ
وجاخە بۆ گەل بۆ من و بۆ تۆ
هەرچەن بە پلەی زانین لە بانی
کە بێ عەمەڵ بێ دیارە نەزانی
نە لێکۆڵەرە نە بڕوا زێکە
کەرێکە باری چەن کتێوێکە
زانین مامۆستای باوەڕ و بیرە
پایە و بناغەی فکر و تەدبیرە
تەدبیر بۆ هەمو، نە خورد و پۆشین
زیاتر لە خەڵکی بۆ خۆ تێکۆشین
کەسێ زانین و تەقوای دا بە ماڵ
خەرمانی دینی بو بە کۆی زوخاڵ
زانای بێ تەقوا وکوێر چرا بەدەس
هەر دویان دورن لە ئەسڵی مەبەس
شەقام و ڕێگەت پێ ئەدەن پیشان
خۆیان بە کوێری بێ ڕێگە و نیشان

نـــور ئەبـــارێنن بـــەسەر عـــاڵەم دا
خوێـــان ســـەرگێژن لە مـــژ و تـــەم دا
زێـــڕ و مـــاڵ ئـــەدەن هـــیچێ نـــاسێنن
تـــەمەن بـــە فـــیرۆ دا ئـــەدۆزێنن
بـــە وێـــنەی خـــەوتو پـــەل دەوەشـــێنن
بـــە وڕێـــنەی خـــەو خـــەڵکی دەدوێـــنن
هـــەر بـــەو وڕێـــنە مـــن و تـــۆ لە خـــەو
رائـــەچڵەکـــێنن جـــەنگەی نـــیوە شـــەو
بـــەڵامێ خوێـــان ســـەرمەستی خـــەون
دیـــل و زیـــندانـــی تـــاریکە شـــەون
«عـــومەر» مـــەبەستی ســـەربەرزی تـــۆیە
پیـــاوی پێکـــارە زیـــانە خـــورۆیە

## خەرمانی نور

مـــاڵێ کـــە ئـــاقڵ ئـــاوەدانـــی کـــات
ئـــەشێ دیـــنداری گڵەبـــانی کـــات
دیـــنێ کـــە زانـــا لایـــەنگیری بـــێ
پـــەسەن کـــراوی ئـــەقڵ و بـــیری بـــێ
ئـــەو دیـــنە هەتـــا هەتـــایە هـــەیە
هەتـــاوی خـــاوەن گـــرشەو شـــۆڵەیە

ئـــەگـــەر مـــیریش بـــیت بـــێ پـــەندی ئـــاقڵ
تـــاج و تـــەخت و بـــەخت بـــێ ســـوچە و بـــاتڵ
پـــیـــاوانـــی گـــەورە بـــە ئـــامۆژگاری
ڕێـگـــەی ڕۆشنیـــان بـــۆ کـــردوی دیـــاری
هـــەر کـــارێکت هـــەن بـــیدە بـــە ئـــاقڵ
تـــا لە ئـــاکـــاما نـــەمێنی مـــاتڵ
ئـــاقڵ بـــە نـــوری چـــرای بـــیر و فـــام
بـــاریکە ڕێگـــە ئـــەکـــاتە شەقـــام
ئـــیبڕاهـــیم لەبـــەر تـــیشکی شـــعورا
کـــەوتە مـــل گـــەنج و خەرمـــانی نـــورا
خـــوایـــە تـــۆ بـــیتو ئـــەقڵی ئـــیبڕاهـــیم
«عـــومەر» بـــخە ســـەر ڕێگـــەی مـــوستەقیم

## سێ شت

ســـێ شت لەم دنیـــا رو لە زەواڵـــن
بـــەر لە تیـــا چـــون و پشت لە کەمـــاڵن
مـــاڵێ بـــێ ســـەودا بـــمێنێتەوە
ســـەرمـــایـــەکـــەیشـــی ئـــەتـــاوێتـــەوە
بـــەخێڵی زانـــا، کـــە بـــە کـــەس نـــەڵێ
زانـــین دەبـــێتە هـــەڵمی مـــەنجەڵێ

ئـــەو مــوڵك و مـــاڵە خـــێوەکـــەی کـــەر بـــێ
ئـــەبێ وەك رەجـــاڵ مـــات و پـــەکـــەر بـــێ
مـــاڵێ خـــاوەنی گـــێژە و ســـاویلکە
ئـــاگـــری تـــێ ئـــەچێ وەك چـــڵێ چـــیلکە
دژمـــن بـــە فـــیرۆ ئـــەی خـــەڵەتێنێ
مـــوڵك و مـــاشەکـــەی لە دەس دەردێـــنێ
ئـــیتر بەسەریـــا خـــۆئەسەپێنێ
تـــاورگی بگـــرێ تـــێی ئـــەتەپێنێ
ئـــەی ئـــەوەی خـــاوەن مـــوڵك و ولاّتـــی
دارای بـــاوەڕو بـــیـــری نـــەجـــاتـــی
پـــێت خـــۆشە مـــاڵ و مـــوڵکت بـــمێنێ؟
رێـــزت نـــەشێوێ لە هـــەمو شـــوێنێ؟
گـــاگـــا بـــە لوتـــف و مـــدارا و خـــۆشی
چـــاکـــە لە تـــۆڵەی تـــاوان چـــاوپۆشی
جـــارجـــارێ وەك ژار دڵ و جگـــەربڕ
بـــەردە لەســـینەی دژمـــن گـــڕپەوگڕ
دیـــارە بـــڕێ جـــار ســـەدگۆزە نەبـــات
کـــاری کـــاڵەکـــە مـــارانـــێ نـــاکـــات
بـــەخشینی زاڵـــم زوڵـــمە لە چـــاکـــان
هـــۆی دەردو ئـــێشە لە بـــۆ دڵپـــاکـــان
بـــەزەیی هـــاتن دەر هـــەق بـــە زۆردار
زوڵـــمە لە گـــورۆی بـــێ زۆر و هـــەژار

زاڵمی دڵ ڕەق گەر بلاوێنی
لێت کردووە ئاوی خاوێنی
وەکو خۆر هەڵبیت لە شەوی تاری
گیانت بخەیتە بەر پێی بڕیاری
کاتی تەنگانە لێت هەڵەکا پشت
مڵك و ماڵەکەت دەردێنێ لە مشت
ئەفسانە نیە ئەژدیهای حەوسەر
ئەوە زاڵمە بە بڕوای «عومەر»

## باوەڕ بە دو چت

باوەڕ بە دو شت بە قەولی ئاقڵ
بە بڕوا و بیری ژیرانە و کامڵ
لە عومری خۆتا تا ماوی مەکە
چون بە خەوێك و خەیاڵێ حەکە
یەکەم هاوەڵی لە گەڵ میر و شا
هەر بە خەیاڵێ لێت ئەکا حاشا
دوهەم بە خەوێ لە پڕ بە شەوێ
زەنگۆڵەی دەنگی مندالێ گڕ ئەوێ
دیارە هەر شتێ کە بێ وەفا بێ
ئەبێ وریا بی بۆ دۆسی نابێ

مـــەسپێرە مـــەیلت بـــە لەیـــلی بـــێ مـــەیل
کـــە دڵـــی خـــێڵێ لە خـــەم ئـــەکـــاکـــەیل
لەیـــلێ کـــە مـــەیلی بـــۆ چـــەن هـــەزارە
لە دەرســـی عیشقـــا نـــەخوێندەوارە
کـــەسێ دڵ بـــدا بـــە وەهـــا یـــارێ
وەبـــێ کـــەس دەمـــرێ دڵـــی بـــە جـــارێ
شـــا ئـــەو یـــارەیە هـــەر بـــە خەیـــاڵێ
پەیمـــانی وەفـــا ئـــەنێتە چـــاڵێ
چـــون بـــەرگی وەفـــای لەبـــەر نـــاکـــاڵێ
دای ئەمـــاڵێنێ بـــە قســـەی تـــاڵێ
«عـــومەر» نـــەکـــەویە خەیـــاڵی خـــاڵی
لیبـــاسی وەفـــا لەبـــەر دامـــاڵی

## رازی دەرون

هـــەر چـــی لە لای خـــۆت رازی نـــهێنە
لە لای دۆســـیشت قـــەت مـــەیدرکێنە
شـــایەد کـــە رۆژێ بـــبێتە دژمـــن
زەنگت بـــزرێنێ لە لای پیـــاوو ژن
یـــا هـــەر ئـــەو دۆســـە لە لای دۆســـی خـــۆی
ئـــەویش یـــەکـــێ‌تر، هـــەروا بـــڕۆ بـــۆی

رازی دەرونت لە عالەم تەواو
ئاشکرا کەن و، لێت بکەن بە قاو
ئەڵێن لە دو لێو هەرچی بێتە دەر
لێوی ئەم و ئەوگشت ئەگرێتە بەر
هەر لە دڵتا بێت رازی خۆت چاکە
تا بێژی و بێژی، تۆ مەیلێ کاکە
وەختێ کە بەستت ئاو لە سەر چاوە
بە خاتر جەمی کارت تەواوە
ئەینا بەرگیری جۆگە مەحاڵە
تا سەر چاوەکەی دەمی بەتاڵە
قسەی نهێنی گەورە رازێکە
تاقانە رێبوار لە رێبازێکە
ئەوەی ئاشکرا ناتوانی بێژی
نهێنیش مەیلێ، گەر بێژی گێژی
هیچ کەس وەکو خۆت دۆسی تۆ نیە
ئەگەر ئینسانە یا خۆ پەرییە
وەختێ خۆت وتت لە لای مام و خاڵ
ئەوانیش ئەیبەن ئەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ
«عومەر» لە دڵیا قسەی نەشاردۆ
بۆیە تلیاوۆ بە ئاخی ساردۆ

## هات و ڕۆژیٚ هات

چــی دیٚ لە دەســتت بــیکەی بــە دژمــن
هــەموەکــەی مــەکــە بــژنەوە لە مــن
هــات و ڕۆژیٚ هــات بــو بــە هــاوەڵت
بــوبە دۆســێکی گیــانی لە گــەڵت
بــا لە زۆت هــەڵبێت ئــەو ڕۆژە لە لای
ســەرت بــەرزۆکــەی بکــەی تمیشــای
بــەڵام ســـەرنجی لیٚ دور مــەخەرۆ
لە هــەر بــارێکۆ تــاقی بکــەرۆ
گــاهیٚ دژمــنی بــیٚ هــێز و نــەتوان
کــە بــو بــە دۆست و هــاوەڵی ئینســان
زیــاتر مــەبەستی ئــەوەیە ڕۆژیٚ
هــەڵ هــەڵکەویٚ بــۆی ئــێسکت بکــرۆژیٚ
نــە دژمــن، دۆســیش تــا پــلەی تــەواو
بــە جــێگەی بــاوەڕ نــایێتە حەســاو
بــە خــڵتەی خــوڵتە و بــە کــلکە ســوتیٚ
هــۆشت بــیٚ دژمــن نــەتنێتە پــوتیٚ
کــەسیٚ دژمــنی نەخــاتە بــەر چــاو
بــیٚ هــێز و بــچوك هێنــایە حەســاو
ئــەو کــەسە وەکــو کــەسیٚ ئــەمێنیٚ
کــە ئــەڵیٚ ئــاگــر هــیچ نــاسوتێنیٚ

ئاگر تا کەمە، بیقوژێنەرۆ
با نەتسوتێنێ، گەشی مەکەرۆ
راوچی تا دەسی لە ماڵی کەمان
نەداوە، دەخیل پێی مەدەن ئەمان
ئەینا کە دەرفەت لە دەس رابورێ
بە پەیکانی تیژ جەرگت ئەدڕێ
سڵاو بۆ سەعدی تا ئیمڕۆ «عومەر»
وەکو ئەو بۆ خۆی نەیناسی خەتەر

## چەن ئامۆژگاری

کە بەینی دو کەس کەوتە باریکی
بەڵکو لای بەری شەوی تاریکی
بە باڵی فڕین بە گەروی هاوار
بە چاوی گرین بە زمانی وتار
بە هەست و وجود بە لەش و بە گیان
چرای برایی رۆشن کە بۆیان
کە کارێکی وا لە دەستت نەهات
کارێ وا نەکەی رۆژانی داهات
کە ئاشتۆ بونۆ بێ خەجاڵەت
تۆزی خەم بگرێ ئەو لێوە ئاڵەت

شەڕ لە نێوانی دو کەس کە گڕیا
ئەقوژێتۆ کاتێ سوختی لێ بڕیا
کوڵ کێشی سوختی ئەو گڕ و شوڵە
چلوچۆیەکەی فیتنەی کولۆڵە
بەهاری ئاشتی ئەو فەسڵە هاتۆ
بای شەرمەساری وشکی ئەکاتۆ
گەردون بە بەردی قەدری ئەداتل
ئیتر کەس بۆ ئەو گوێچکە ناکاشل
جا بۆ داگیرسان ئەو حیلە و پیلە
هەر خۆی دەکرێ بە دەستە چیلە
لە لای کۆڕی دۆس کۆمەڵی دڵپاك
تارای بوکی باس هێواش بکە تاك
تا چاوی گوێچکەی دژمن لەو لاوۆ
لە دور نەیبینێ و، بیکاتە چاوۆ
باسێکت هەبێ لە پای دیوارێ
لە دێ و لە شار و هەر شوێنەوارێ
لە دەورو بەرت هەر کونێ دیار بێ
شایەت کە گوێچکەی دەر و دیوار بێ
گەر لە پەناتا دیوارە یا کێو
بڕوانە پەریت لە دەورە یا خێو
لە نێو دو کارا کامیان ڕەوایە
هەڵبیژێرە و بیکە سەرمایە

وەکو هەوری تاڵ مەخوزە لە کەس
دڵڕەقی مەکە نیسبەت بە ژێر دەس
بە تێغی زمان دڵ هەڵمەدڕە
بۆچی پێت بێژن زمانی شڕە؟
زمانی پیس خێوی ئەنێتە ژێر چاڵ
یا خۆ ئەیکاتە تۆشەی قەل و داڵ
شەڕ مەکە لەگەڵ ئاشتی خوازێکا
هەتا گیر نەکەی لە ڕێبازێکا
دۆس مەبە لە گەڵ دژمنی دۆسا
با هەقی دۆسی نەتخاتە کۆسا
لە گەڵ دژمنی دۆسا، ڕوخۆشی
یانی لە مانای دۆسی چاوپۆشی
لەوەها دۆسێ دەستت بشۆرە
کە لە گەڵ خێڵی دژمنت جۆرە
چون چاوی دۆسی ئەینێتە گریان
بە هەناسەی بای دڵ سەردی زریان
هەروا گوڵاڵە سورەی دۆسانە
ئەو خونچە سورەی، سۆرەی پەیمانە
کاڵ دەکاتەوە و دای ئەمرکێنێ
لای دڕك رازی گوڵ ئەدرکێنێ
کارێ بە پارە دروس ئەبێ بۆت
مەیخە مەترسی ئیتر گیانی خۆت

وەختێ بە ماڵ و بە پوڵ و پارە
پێك نەهات ئەم ڕا چارت ناچارە
بە بریقەی شمشێر بۆ ئاخرین فێڵ
ڕێگەی ڕۆشنی دژمن بکە لێڵ
دژمنێ هەرگیز نەتبەخشێ جارێ
بارانی ڕەحمت قەت بۆی نەوارێ
ڕەحمی پێ مەکە مەڵێ بێ هێزە
کە هێزی تێ هات بە نوکی نێزە
جەرگت کون دەکا تا بە خوێنی تۆ
دڵی تۆراوی بێنێتۆ سەرخۆ
با زۆر بە هێز بی زۆریش بتوانی
نایێ دژمنت بە کەم بزانی
چون ئەمیش خاوەن مێشك و هەناوە
هەر کەس لە کراسی خۆیا پیاوە
«عومەر» سەرکێشە ئەسپی مەغروری
پەس هەتا ماوی لێی بکە دوری

## لا یە لا یەی خەم

کوشتنی زاڵم دو جار بەکەڵکە
یەکەم بۆ زاڵم دوهەم بۆ خەڵکە

خـــۆی لە قـینی خـەڵك خـەڵكیش لە شـەڕ ئـەو
نەجـــاتیان ئـــەبێ لە تـــاریکە شــــەو
هــەم خـــۆی لە تـــاوان دەســتی دەبــێ کــوڵ
هـــەم لە مـــەزرای گـــوڵ دەفـــەوتێ پـــێکوڵ
بـــەخشین رەوشـــتێ جـــوان و رەوایـــە
بـــەلامێ مـــەردوم ئـــازار جـــودایـــە
بـــا تـــێغ و نـــەشتەر دولەت کـــا جـــەرگی
تیمـــاری مـــەکـــە تـــا دەمـــی مـــەرگی
بـــەزەیی هـــاتن بـــە دو پشك و مـــار
دورە لە بـــڕوای مـــرۆڤی هۆشیـــار
کـــەسێ بـــۆ زاڵـــم بســـوتێ دڵـــی
ئـــاگـــر ئـــەچێتە خەرمـــانی گـــوڵی
دڵت نـــەسوتێ بـــۆ دژمـــنی گـــەل
چـــون پـــیسترێکە ئـــەو لە مـــاری شـــەل
لە قـــرچـــە قـــرچـــی هـــاوینی خـــەما
نەهـــاتی دێـــنێ بـــەسەر عـــالەما
لایـــە لایـــەی خـــەم بـــۆ نـــاپیاو کـــردن
هـــۆی ســـەر شـــۆڕییە هەتـــاکـــو مـــردن
کـــۆرپەی ئـــازادی لە نـــێو چـــاڵ نـــانە
لانـــی کـــەم لانکـــەی هـــەژار سوتـــانە
ئـــاو دێـــری دڕکـــە بـــە ئـــەسرینی چـــاو
بـــێکەس کـــوشتنە بـــە دەرد و زوخـــاو

باش گوێچکە شل کە بۆ قسەی دژمن
قازانجی هەیە لە دژمن بیستن
بەلاّم بە قەولی قەت مەکە عەمەڵ
سەری پیاوەتیت با نەبێ کەچەڵ
هەرچی ئەو ئەڵێ تۆ پێچەوانە
بچی بە رێدا، ئەو رێگە جوانە
دوریکە لەوەی کە دژمن ئەڵێ
بیکە، دەخیلە لەقەولی هەڵێ
ئەو رێیە دژمن پێتی نیشان دا
تۆ بەرێ ئەکا بەرێی نەماندا
تابە وتەی ئەو بچی بە رێوە
بەرێوە ناچی، بەسەر دو پێوە
بە قسەی دژمن هەتا عەمەڵکەی
تۆ دەستە ئەژنۆ و، ئەو ئەڵێ ئۆخەی
کام رێگە راستێ ئەو بیدا نیشان
بەچەپا نەچی،دەبیەتە نیشان
بەوێنەی «عومەر» لە تاڤگەی ژیان
هەڵتە هاوێنە نێو بەحری خەمان

# رێگەی ناوەڕاست

ئـــەی ئـــەوەی خـــاوەن مـــاڵ و مـــنداڵـــی
مـــەڵێ بـــێ حـــاڵم لێـــم نـــابێ حـــاڵی
ئـــەگـــەر پـــێت خـــۆشە نـــەشێوێ ڕێـــزت
هـــەر بـــەردەوام بـــێ قـــودرەت و هـــێزت
ڕێگـــەی نـــاوەڕاست گـــەر بگـــریتە بـــەر
دوری لە ڕێگـــە کـــوێرەی، دەردی ســـەر
نەتـــاڵ چـــون کـــەکـــرە نـــەشیرین وەك قـــەن
نـــە ســـاف وەك حـــەریر، نـــە تـــیژ وەك بـــڕوەن
زۆر تـــاڵ بـــی، تـــفت دەکـــەنۆ لە دەم
زۆریش ڕۆشـــن بـــیت دەســـوتی وەك شـــەم
نـــە هـــێندە تـــاڵ بـــە لێت بـــێزار بـــێ، زار
نـــە ئـــەونەش شـــیرین قـــوتت دەن یـــەکجـــار
بـــە زەبـــری و نـــەرمی کـــار ئـــەبێ مـــەیسەر
حـــەکـــیم خـــاوەنی مـــەڵهەمەو نـــەشتەر
عـــاقڵ کـــەسێکە تـــەواو تـــاڵ نـــەبێ
لە هـــەر بـــاسێکا کـــەڕ و لاڵ نـــەبێ
نـــە لە هـــەموکـــەس خـــوێ بـــانتر بگـــرێ
نـــە بـــە هـــەژەشەی نـــاکـــەسێ بـــمرێ
گـــەنجێ شـــۆڕەکـــوڕ بـــە بـــاوکی فـــەرمو
ئـــەی ڕەمـــزی زانـــین پـــیری ڕیش چـــەرمو

تـــۆ ڕۆڵـــەی ژیـــری زەمـــانەی پـــیری
ئـــاوەنگی گـــوڵی بەهـــاری بـــیری
فـــێرم کـــە دەرســـێ پـــڕ لە مۆژگـــاری
بـــە نـــرخ و بـــایەخ وەکـــو مـــرواری
فـــەرموی جـــوامـــێری بکـــە تـــا شـــوێنێ
گـــورگی دڕ کـــەڵوەت لێ نـــەتەقێنێ
«عـــومەر» چـــاو بـــڕین لەو شـــۆڕە کـــوژە
قـــیمەتی بـــانتر لە لیـــرە و دوژە

## دژمنی دنیا و دین

دو کـــەس دژمـــنن بـــۆ دنیـــا و بـــۆ دیـــن
ســـەرۆکـــی قـــەڵس و شـــێخی بـــێ زانـــین
یـــا ژەب ســـەرۆکـــی تـــوژە و دڵ بـــەردین
لەمـــە کـــە تـــرۆپکەی هـــەژاری و دەردیـــن
دوری خـــەیتەوە و، لە گـــەڵ ئـــەو شـــێخە
بـــەرەو جەحـــانم بـــارگەیان ڕێـــخە
مەمـــانکە تـــوشی ســـەرپل و نـــەزان
بمـــان پـــارێزە لە نـــەفس و شەیتـــان
ســـەرۆکـــێ چـــاکـــە حـــوکمی بـــە دەس بـــێ
هـــەوەس دابـــنێ و هـــۆزی مـــەبەس بـــێ

دڵڕەقــی ســەرۆك سەبــارەت بــە گــەل
بــە هــەوای هــەوەس کــە دایــەوە پــەل
بــاوەڕی مــیللەت ئــیتر نــامێنێ
بــە بــمرێ ســەرۆك لێــو ئــەبزوێنێ
ئــاگــری قــین و ئــاڵۆزی دەرون
هــەوەڵ خــاوەنی ئــەنێتە نــاو تــون
ئەمجــار بــڵێسە و زوانــە دەکــێشێ
بــۆ شــانە و شــان و بــۆ پــاش و پــێشێ
تــۆ رۆڵــەی خــاکــی بــۆ خــاکــی نــابێ
تــیژ و ســەرکێش و تــون وەکــو بــابێ
تــا وەك ســورە مــار یــا بــڵێسەی گــەش
هــەڵمەت بــهێنی بــۆ گیــان و بــۆ لەش
نــاڵێم کــە خــاکــێ نــەرم و نیــانی
ئــەڵێم پــێت کــێوێ ئــاگــر بــارانــی
لە شــاری ســنە زانــاییکم دی
چــومە پــێشەوە، ئــەمەم لێ پــرسی
چــۆن رزگــاریم بــێت لە دەس نــەزانــین
وەڵامــی دامــۆ وەڵامــێ شــیرین
فــەرموی کــاك مــەلا یــا ســەرخــۆ وەك خــاك
یــا بــینێ ژێــر خــاك عــیلمەکــانت پــاك

# مرۆڤی روتاڵ

دژمنی پیاوە روترشی و گرژی
خاوی ئەکاتۆ حورمەتی کرژی
لە دەستی دژمن مرۆڤی روتاڵ
خەلاسی نابێت حەوتەو مانگ و ساڵ
لە حەو عاسمان بێفەڕ تێپەڕێ
رەوشتی پیسی خۆی لێی ناگەڕێ

# لە دو خێر یەکێ

کە سوپای دژمن بو بە چەن دەسە
بۆ زاڵ بونی تۆ هەر ئەوە بەسە
دانیشە لەگەڵ یارانی یەکڕەنگ
کە بینیت لە نێو دژمن قڕە و جەنگ
کاتێ ئەو مەڕەی قڕەی لێ بڕا
لە ماڵ و، لە کێو، لە دەشت، و خڕا
ئەبێ وریا بی سەنگەر چۆڵ نەکەی
هەوای سەیرانی خڕ و دۆڵ نەکەی
خۆت و سوپاکەت تیر بە دەستەوە
سەر بە بیرەوە و، دڵ بە هەستەوە

هەرهــاتە پــێشیٚ دەس بــە دەســڕێژکە
لەشــی بــە گــوللە، دابــێژ دابــێژ، کــە
هۆشیــار و بێبــاك تــیر لە نــاو چــللە
لە راست و چــەپۆ بــیدە بــەر گــوللە
دژمــن بــە هــەزار فــێڵ و تــەڵەکــە
خــەریکی نــەخشەی فــەن و کــەڵەکــە
کــە دەســتی بڕیــا لە هــەمو فــێڵیٚ
ئەمجــارە عــەرزی دۆســتی دەکــێڵیٚ
لە ڕێگــەی دۆســتی کــاریٚ ئــەکــا پــێت
بــە هــەزار دژمــن نــەیهێنن بــەڕێت
بــە دۆســی پــۆسی خــوٚت پــیٚ دەکــەنیٚ
خــەڵقی عــالەمت «گ» پــێدەکــەنیٚ
دژمــن بکــەرە تــوشی دژمــنۆ
خــۆتیش ســەیریکە لە یــەك قــوژبنۆ
ئــەڵێن ســەری مــار بــە دەســتی دژمــن
لە بــار و چــاکــە بــۆ پــانۆ کــردن
چــون لە دو خــێرا یــەکــیٚ تــێتە بــار
یــا دژمــن ئــەمریٚ یــان دەتــۆپیٚ مــار
لە ڕۆژی شــەڕا قــەت مــەڵیٚ دژمــن
کــەم هــێزە لە چــاو هــێزی قــۆڵی مــن
بــیٚ هــێزیش لە گیــان کــە دەس بشــۆریٚ
شــێر لە زەربــەتی مشــتی ئــەتۆریٚ

ئەڕوا بۆ شاری نەبزوانەوە
ئەچێتە ڕێزی مردوانەوە
کاتێکت زانی ڕۆژێکیش «عومەر»
رو بە ئەو ڕیزە، ڕێگەی گرتە بەر

## هەواڵی خراو

لە گێڕانەوەی هەواڵی خراو
هەتا بۆت ئەلوێ خۆگێل کە تەواو
هەواڵێکی وا ئازارە بۆ دڵ
تۆ بۆ وتنی خۆت بکە ماتڵ
با یەکێکی‌تر بیڵێت ئەو باسە
تۆ ساردۆ مەکە گەرمی هەناسە
تۆ کە بولبولی مزگێنی بەهار
بێنە بۆ کۆمەڵ لە لادێ و لە شار
هەواڵێ کە دڵ ئەکا مات و کش
بیدە بایەقوش بۆ ئەو چاکە چش

## جم و جوڵی لێو

دەم بــقو چــێنە لە لای زۆرداران
تــاوانبــار مــەکــە گــرۆی هــەژاران
چــونکە بــەم کــارە تۆیــا تــاوانبــار
ئــەبن بــە قوربــان زاڵــمی زۆردار
کــە بــاوەڕ کــا پــێت ئــەو دەخــنکێنێ
بــاوەڕیش نــەکــات خــۆت ئــەسوتێنێ
جــم و جــولی لێــو خەســاری زۆرە
هــۆی گــەلێ دەردە و، زامــێ نــاسۆرە
قســە بــنچینەی رێــزی ئینســانە
خــاڵی جیــاوازی ئــەو و حــەیوانــە
قســەی بــاش بــلێ بــا رێــزت نــەچێ
قســە قســەیە نــەك ســەرەتەچێ
ئــەڵێن قســەی پیــاو گیــانی لە بــەرە
کــوشتنی قســەش قــەتڵی بــەشەرە

## شەرعی شعور

مۆژگــاری کــردن شــەخسی خودکــامە
بــە شــەرعی شــعور کــارێ حــەرامــە

مۆژگــاری کــەری پیــاوی ســەرەخەر
خــۆیشی رەجــاڵە بــۆ مۆژگــاری‌کەر

## با بە قول کردن

دوشت ســەر چــاوەی فــێڵ و فــریون
مــایەی دڵــخۆشی هــەتیو مــەتیون
خــولتەی دژمــنت چــەشەی خــەتەرە
قســەی تــاریفکەر تــەڵەی زەرەرە
یــەکێکیــان داوی فــێڵی دانــاوە
ئەویــان داوێــنی تەمــاحی، داوە
لە تــاریف کــردن خــۆشی دێ نەفــام
هــۆی ئــەم خــۆشییەش رۆنــاکــە وەك جــام
دیــارە کــە نــەزان ئــەقڵی مــردوە
قــوزی بــێ ئــەقڵی بــە سەریــا چــووە
نــازانــێ بــۆیە وای دەمــاسێنن
تــا بــەو مــاسینە پــێستی دەربــێنن
بــا بــە قــول کــردن هــەر کــاری زووە
قەســاوی پــێس‌کەن دەمــی پــڕفووە
گــوێ مــەدە تــاریف چــونکو تــاریفکەر
تەنیــا ســەرفی خــۆی، ئــەگــرێتە نــەزەر

ئــەگــەر قــازانــجت نــەبێ بــۆی رۆژێ
بــە تــانە و تــەشەر ئــێسکت ئــەکــرۆژێ

## بای خەزان

قســە وێــژ هەتــا رەخــنەی لێ نــەگــرن
رۆڵــەی وتــاری پــێ نــاگــرن، دەمــرن
بــە وتــاری خــۆت هــەرگیز مەنــازە
لە خــۆت و نــەزان پــایە مــەخوازە
خەیــاڵی خــۆت و تــاریفی نــەزان
ســاردت دەکــەنۆ وەکــو بــای خــەزان

## لە عەرشۆ تا قورش

هــەر کــەس پــێی وایــە لەم دنیــا پــانە
ئــەقڵی تــەواوە و رۆڵــەیشی جــوانــە
یــا ئــەڵێن ژیشك ئــەڵێ رۆڵــەکــەم
کــەوڵی حــەریری نــەرم و نــۆڵەکــەم
کــوردان وا ئــەڵێن لە عــەرشۆ تــا قــورش
هــیچکە بــە دۆی خــۆی هــەرگیز نــاڵێ تــورش

پیاوێ مسوڵمان لەگەڵ پیاوێ جو
لە سەر مەبەستێ قڕەقڕیان بو
لە گوێسوانی لێو مەلی پێکەنین
بەو قڕەقڕە کەوتە هەڵفرین
مسوڵمان ئەیوت بە تانە و تەشەر
ئەم قەباڵەمە، درۆیە ئەگەر
لە هەر دو دنیا، خوایە وەکو جو!!
منی درۆزن حەساو بفەرمو
لێوی بزێوی جو، لەوەلاما
دور لە دو دڵی و ئەمما و بەلاما
دەم بە وتارۆ کەوتە چاوە بز
وتی مسوڵمان درۆزنە و دز
سەدرا بە تەوزات سوێنت بۆ ئەخۆم
درۆم پێ پیسەکەی من وەکو تۆم
ئەگەر بێ بایەخ داواکارم لێت
مسوڵمانێکم منیش وەك تۆی شێت
پەس هەرچەن زانین لەم دنیا لاچێ
گەردون لق و پۆی بالای هەڵپاچێ
هێما بەم حاڵەش، کەسێ یا خەسێ
ناڵێ نەزانم بە هیچ مەبەسێ
عومەر تۆ تازە رون ئەیێتۆ لێت
نەزان زانایە و، کانی فامە شێت؟

# ئاوی حەوسەڵە

لە سەر یەك سفرە دەکەس دەسازن
بە نانێ رازین یەکتر ناگازن
لە سەر کەلاکێ بەڵام دو گەماڵ
لە یەکتر ئەکەن بە حەپلی حەپاڵ
پیاوی تەماحکار وەك سەگی برسی
ناهێڵن تێر بێ، تەماح و حیرسی
وەلێ بێ تەماح تێرە بە نانێ
بۆ ماڵی دنیا رێزی دانانێ
ماڵداری حەریس دایم رەجاڵە
بێ ماڵی قانع خاوەنی ماڵە
ریخۆڵەی خۆراك بە نانێ پڕە
دنیا بە چاوی بەخێڵێ خڕە
ورگ بەسیەتی نانێکی تیا بێ
چاوی تەماحکار بە هیچ تێر نابێ
باوکم بەر لەوەی نەمێنێ لە لام
لە سەرە مەرگا پەندێکی دادام
کە داوێن پیسی گڕی ئاگرە
لە گڕەی دۆزەخ خۆت پەنا گرە
بڵێسەی سوری ئەو گڕ و شوڵە
ئازای ئەندامت ئەکا بە کوڵە

تــا دەرفــەت مــاوە بــیقوژێنەرۆ
بــە ســوختی شــەهوەت مــەیگەشێنەرۆ
ئــاوی حــەوسەڵە بــەو گــڕە ، فــێرە
پیــاوی بــێ تەمــاح ئــاقیبەت خــێرە

# کاتی تەنگانە

هەتــا ئــەتوانــی وەخــتێ مــاڵت هــەس
بــبیەخشە بــە خــەڵك بــە تــایبەت ژێــردەس
بــە مــاڵی دنیــا و بــە تــوانــایی و هــێز
بــۆ ئــازاری گــەل مــەنیشە پــارێز
تــا چــاکــی نــەکــەی بــە مــاڵ و گیــانت
کــاتی تەنگــانە تــاڵە ژیــانت
تــاڵەبەهــاری خــوشیــدا زیــزی
شــان و مــل روتــی فــەسڵی پــاییزی
بــۆ رۆژە رەشــی کــەس تــێمەکــۆشە
گش کــەسێ وەك تــۆ ژیــنی پــێ خــۆشە
دیــارە کــەسێتر وەك مــەردوم ئــازار
رۆژی رەش نــیە لە روی رۆژگــار
لە روی مەردومــا تــرسنۆکــە و کــز
مــاتە وەك تــانجی، پــێسە ســیراج دز

# ماڵی گڕ و فڕ

لە کوردەواری ماڵی گڕ و فڕ
بەو شتەی ئەڵێن دەس کەوێ لە پڕ
یاخۆ لە سایەی تەلاشیکی کەم
بە دەستت کەوێ بێ مەینەت و خەم
هەڵبەت ئەو جۆرە ماڵە بێ پیتە
دڵ پێ خۆشکەری ئاخری خیتە
دیارە هەر ماڵێ کە زو بە دەس بێ
یا کەم قیمەتە یا زو تیا دەچێ
بیستومە چینی ئەیشێلن چل ساڵ
جا دەکرێتە قاپ، دەخرێتە ناو ماڵ
سەد گۆزە لە گڵ لە دەشتی مەروا
لە کوردستانی خۆشمانا هەروا
دروس دەکرێن وەلێ دەبینی
نرخی ئەم لەکوێ تا نرخی چینی
هەرچەن لە لای من گوزەی سوری گڵ
بەرهەمی هەوری ژنی کورد و کڵ
گرەو دەباتۆ لە چین بە سوکی
بە بەڵگەی سەرشیو یا خوردەلوکی
مەبەستی ئەسڵی بێنینۆ کایە
ماڵی گڕ و فڕ وەکو چی وایە؟

وەک جــوجکە وایــە تــا ســەری دەرتــێ
دەنــوکی بــۆدان دەکــوتێ بــێ شــەرتێ
بــە زەنــجی دایك کــۆرپەی شــیرەخۆر
دەگــرێ گــۆپیتکەی مــەمکە هــەر بــە زۆر
تــا دێــتە بــار و، تــۆزێ ژێــر ئــەبێ
دایکــی بێچــارەی تــەواو پــیر ئــەبێ
ئــیتر تــێفکرە لەئــەسڵی مــەبەس
مــەینەت و فــیرۆ چــەندە مــەودای هــەس
چــون ئــەم هــۆی مــەینەت ئــەوگــڕوفڕن
کــۆرپە دەمــێنێ و ئــەو ســەر دەبــڕن
کــەسێ کــوتوپڕ بــبێتە کــوژێ
ئــەسپی مــرادی قــەت لێ نــاخۆرێ
ڕۆژێ ســەد شــیشە لە ژێــر پــا دەشکــێ
خــەمی بــۆ نــاخۆن وەك ســەلکەکــەشکێ
حــورمەتی نــیە ئــاێینە لای کــەس
چــونکی بــە هــەرزان دەکــەوێتە دەس
لەعــلێ بــە چــل ســاڵ لە بــەردێ دەردێ
کــێت دی بشکــێنێ لەعــلێ بــە بــەردێ
مــاڵی بــێ قــیمەت لەم دنیــا زۆرە
هــۆنراوەی عــومەر بــۆ وێــنە جــۆرە

# بێ دەنگی

بۆ هەر نەزانێ خێرە بێدەنگی
چون کە دەنگی کرد، ئەزرێ زەنگی
بەلام ئەگەر ئەو ئەمەی ئەزانی
ئەبوا پێی بڵێن زانای دەورانی
وەختێ دەزانی زمانت کوڵە
هەرچەن مەیانی وت و وێژ چوڵە
هیچی لێ مەڵێ با رسوا نەوی
با بە نێو چاڵی سوکی نەکەوی
گوێزێ کە سوکە هەر هەڵدەخاتۆ
بێ مێشکە و پوچەڵ کە دەم دەکاتۆ
وەختێ نازانی، مەبزێوە لێوت
تا وەك ئەو گوێزە سوك نەبێ نێوت
گەلێ تێکۆشا نەزان و گێژێ
بەلکو بە قسە بێنێ گوێرێژێ
زانای زەمانێ پیرێ رۆشن دڵ
فەرموی هەی کابرا خوت مەکە ماتڵ
جەرگت ئەدورن بە تیری تەشەر
گەر بە هیوا بی کەرکەیتە بەشەر
کەر حالی نابێ ماناى وت و وێژ
تۆ فێر بە واتەی بێدەنگی گوێرێژ

چێشتی وتاری کەسێ نەکولاَن
بێ تامە و لەززەت لە زاری دلاَن
یا بوکی قسە برازێنۆ جوان
یا بێدەنگ و کەڕ وەکو بێ زوان
عومەر چون قسەی بۆ نایێ بە دەم
قەڵەم بە جێگەی دەسوتێ وەك شەم

## زۆرم بینیوە

هەر ئیش و کارێ بە سەبر و تەدبیر
بەدی هاتووە لە زەمانەی پیر
دیارە تاڵۆکە، لە ئیش و کارا
سەری خۆدانە بە بەرد و دارا
کەسێ پەلەپەل بداتە بەری
زەوی دەکا ماچ تەپلۆکەی سەری
زۆرم بینیوە بەم هەر دو چاوە
سوکڕەو چالاکی داوە بە دواوە
چالاك هیلاك و ماندوی پەلەیە
یا کوڵەواری ڕێی تاڵۆکەیە
سوك ڕەو لە ئەسپی حەوسەڵە سوارە
ڕێی هەورازیشی وەك بەرەو خوارە

چارەوای تیژەو بە وێنەی خەیاڵ
زۆر پڕتاوی بەی دەپڕوکێ دەرحاڵ
بڕوانە وشتر بێ عەجەلەیە
مانگێکیش بڕوا هێزی پای هەیە

## چەن ئامۆژگارییەك

بۆ بەرزی پلە یا ماشەڵای گێژ
لە گەڵ زانا دا مەکە وتو وێژ
مەڵێ با دەرچێ بەم کارە ناوم
بەم تاوە نەبێ لەم کۆرە ناوم
تێ هەڵچون لە گەڵ زاناتر لە خۆت
بۆ رادەی پایە و پلەی گفتوگۆت
هۆیە بۆناسین گێژیو نەزانیت
کەری و، نەفامی و، گەوجی و، مل پانیت
کە بانتر لە خۆت هاتە وت و وێژ
رەخنەی لێ مەگرە با جێت نەبێ لێژ
کەسێ هاوەڵ بێ لە گەڵ بەدکاران
خۆشی نابینێ لە خۆی چ جاران
لە هاوڕێی خراو هەتاکو ماوی
غەیری خراوی شتێ فێر ناوی

گـــورگی کـــڵبە تـــیژ کـــێ دێ لە بـــیری
لە گـــەڵ بـــەر خـــۆڵە پـــاك بـــوبێ شـــیری
پـــیشەی گ گـــورگێ هـــەر قەســـاوییە
چـــونکو ئـــەو ئـــیشە پـــیشەی بـــاوییە
تـــۆ کـــە فـــریشتەی مـــەبە یـــاری دێـــو
هـــەرگیز کـــوژاڵکت بـــۆ نـــابێ بـــە ســـێو
ســـیخوڕی مـــەکـــە بـــۆ عـــەیبی خـــەڵکی
خـــراپـــیش مـــەکـــە مـــادام بـــێ کـــەڵکی
خـــەڵك رســـواکـــەر خـــۆیشی رســـوایـــە
بـــە جـــێگەی بـــاوەڕ بـــە حەســـاو نـــایە
نیشـــانەی زانـــین ئـــیشو و عـــەمەڵە
زانـــای بـــێ کـــردە گـــورگ و چـــەقەڵە
کـــەسێ ســیپـــاڵی زانـــینی پـــۆشا
بـــۆ ئـــیش پـــێ کـــردن کـــە تـــێنە کـــۆشا
وەك فـــەلاییکە لە قـــەوم و خـــێڵێ
تـــو نـــەوەشێنێ و زەوی بکـــێڵێ
زانـــای بـــێ کـــردە بـــێ دڵـــە لەشـــی
ئـــەو بـــەش گـــەل نـــادا و، گـــەل نـــادا بـــەشی
دیـــارە بـــێ خـــێرە وەهـــا زانـــاێ
وەك دەخـــڵی بـــێ مـــێشك ئـــاردی لێ نـــاێ
هـــەرچـــەن پـــێی ئـــەڵێن زانـــا، نـــەزانـــە
«نـــاوێ گـــرانـــە و شـــارێ وێـــرانـــە»

زۆر ژن بە باڵا جوانن لە دوورۆ
خۆ ئەنەخشێنن بە زەرد و سوورۆ
لە دایکی دایك پیرترن وەختێ
تارای زەرد و سوور لابدەن نەختێ
دەترسێ لێیان ورچ و رموزن
بە مانە ئەڵێن سەر سوری بێ بن
یارانلەمانە، هەرسڵ بکەن سڵ
«لەم دورکوژانەی نزیك پوکاوڵ»
ئەمانە ماری، پیس و زامارن
جوتەی قاتری، نەحس و لاسارن

## دەردی بەرد

لە ساڵا شەوی قەدر یەك شەوە
بۆیە بە رێز و خاوەن بڕەوە
شەوی قەدر بێ ئەرهەمو شەوێ
نازی نامێنێ و هەتیو ئەکەوێ
کانی گەوهەر بێ گەر هەمو بەردێ
گەوهەریش دەردی بەردی بەسەر دێ

## ئەبێ وریا بی

هەرکەسێ جوان بو، بە وێنە و شێوە
پیاو بکا لێوە کە چو بەزێوە
مانای وانیە دڵیشی جوانە
پڕ لە ئاوێنە و، جێگای متمانە
بە تاقە تیشك و سرنجی چاوێ
دیمەن دیارە، زەحمەتی ناوێ
رادەی زانینیش بە بیرو زەینێ
رون ئەبێتەوە، پاش ماوە و بەینێ
بەڵامێ پاکی و پیسی نێو دەرون
شێوەی شەپۆلی لە کەس نیە رون
ئەبێ وریا بی شەڕی پیسی دڵ
سەراپای لەشەت نەخاتە نێو گڵ

## کوڕی حەشیش

تێ هەڵچون لە گەڵ بانتر لە خۆتا
عومری درێژت لێ ئەکا کوتا
خۆبە گەورە زان نەزان و گێلە
چاوی بیر و رای وەك چاوی خێلە

ئـــەڵبەت وەکـــو خـــێڵ یـــەك بـــە دو بـــینین
مـــرۆڤ لائـــەدا لە زێـــی خۆنـــاسین
لە گـــەڵ بـــەرانـــا ســـەرەتەقێ کـــەر
تـــەوێڵی ئـــەشکێ و مـــێشکی دێـــتە دەر
کـــێ بـــەرکێ لە گـــەڵ شـــێری ژیـــانا
لە ژیـــن تـــێر بـــونە، لە ریشـــە و مـــانا
لە روی شـــمشێر زەن بـــە چـــەقۆیێ کـــول
مـــەوێسە بـــاکـــو قـــول نـــەکـــەی بـــە فـــول
تـــەپکە دامـــەنێ بـــۆزاوی بـــەراز
دەرزی بـــۆ دار گـــوێز نـــاوێتە پـــواز
کـــەسێ ئـــاقڵ بـــێ دورە لە کـــارێ
کـــە هـــۆی مـــەینەت بـــێ بـــۆ هـــەمو جـــارێ
شـــەڕ و کـــێ بـــەرکێ لە گـــەڵ پـــڕ زۆران
گیـــانی لە لەشـــی گـــەلێ کـــەس تـــۆران
لە لای ئـــەو کـــەسە پـــەنجەی بـــە هـــێزە
گیرفـــان بـــۆ دو دەس شـــوێنێ بـــەزێزە
بـــێ هـــێزکـــە بـــردی هـــەڵمەت بـــۆ بـــەهێز
خـــۆیشی بـــۆ گیـــانی خـــۆی وا لە پـــارێز
خـــۆیشی کـــۆمەکـــە بـــۆ تیـــا چـــونی خـــۆی
خـــونچەی تـــەمەنی ئـــەزوا رەنگ و بـــۆی
لە ژێـــر ســـێبەرا کـــەسێ شـــەوو رۆژ
کـــولم و دو لێـــوی نـــەگـــرن تـــۆز و تـــۆژ

کەی ئەوە رۆڵەی مەیدانی جەنگە
ئەو کوڕە کوڕی حەشیش و بەنگە
وا چاکە بۆ ئەو بەلەشی شلۆ
شوێنێ پەیداکا لە دورو کلۆ
تێ هەڵچون لەگەڵ پیاوی پۆلاَ مشت
ئاوی ژیانی گەلێ کەسی رشت
عومەر مەترسی نانێتە بەرت
بەس بۆتی ئەڵێ سەرف و زەرەرت

## سەرزەنش

کەسێ نەبیسێ مۆژگاری مەردوم
لە نێو دوکەڵی ژینا دەبێ گوم
وەختێ موجگاریت لێ نەبو حاڵی
ناوێ لە ئێشی تانە بناڵی
هەرچەن سەرزەنش کون بکا جەرگت
نابێ هیچ بڵێی تا دەمی مەرگت

## بێ هونەر

بێ هونەر چاوی بینینی کوێرە
لە حەنای کەسێ هونەرێ فێرە
چون خۆیان خاوەن خێر و چاکی نین
دڵیان سەرچاوەی بەخێڵی یەو قین
لە حەیوانیشا ئەم باوە باوە
تەمبەڵ و خوێڕی کرژی پێ خاوە
سەگانی ماڵی چون بێ هونەرن
لە وەختی راوا بێ سەر و بەرن
تانجی پڕئەدا لە گورگ و بەراز
ئەمان لە لاقی خەڵکی ئەگرن گاز
لە پشتە سەرۆ بەخێڵی چەپەڵ
ئەژمێرێ پیاوی وریا بە دەغەڵ
بەڵام بەرەو رو زمانی لاڵە
بە ئایەی زانین سێحری بەتاڵە

## زۆر خور

زۆر خۆری چڵێس هەر ئەنکێنێ
وەك ژنی زگپڕ کە ژانێ دێنێ

چـــونکی خـــولاّمی نـــەوسو زگـــیەتی
ســـاڵ دوازدە مـــانگە نکـــەنکیەتی
هــەرکەس بــەبەزمی زگـــی هــەڵپەڕێ
چـــون کـــەر ئـــەزەڕێ وەك ســەگ ئـەوەڕێ
کـــە پــەڵپ وگـــڕوی نـــەوس و زگ نـــەبێ
مـــلی چـــەمەڵێ بـــە داوۆ ئـــەبێ
راوچـــیش ئـــەم رازە هەتـــا نـــەزانـــێ
لە عـــومری خۆیـــا داوێ دانـــانێ
کـــاکـــە گـــوێ بگـــرە لەم نـــیکتە جـــوانـــە
چـــون بـــاسی زگـــە ئـــەمەش بـــزانـــە
حـــەکیمـــان رۆژێ بـــە تـــاقە ژەمـــێ
تـــێرن و بـــۆ زگ نیـــانە خـــەمێ
عـــابیدان رازیـــن بـــە نـــیمە تـــێری
تـــاعەت بـــە تـــێری چـــون نـــیە خـــێری
زاهـــیدان ئـــەونە ئـــەخۆن کـــە نـــەمرن
لاوان تـــا کـــاتێ ســـفرە هـــەڵدەگـــرن
پـــیریش تـــا ئـــارەق ئـــەکـــا خـــەریکە
چـــونکی بـــێ هـــێزە پـــوکی بـــۆ تـــیکە
وەڵێ هـــەرکەسێ چـــڵێسە و چـــاو چـــو
لە قـــەلاّی ســـفرە دەخـــوێنێ وەك بـــو
دیـــلی زگ و نـــەوس بـــە راســـتی شـــەوێ
نـــاحەوێتەوە و ســـاتێ نـــاسرەوێ

هەر شەوێ تێر بێ لە بەر دەرد و ئێش
تاکو بەیانی لەش ئەکاتە کێش
هەر شەوێکیشی زگی خاڵییە
وەك رۆڵە مردو ناڵە ناڵییە
زۆرێ لە خەڵکی بۆ زگ و نەوسی
پشتی لە ژێر بار خوێن مژان چەوسی
هەروەکو کوردێ پشتی داچەمی
کە غاری ئەدەن بە نانە لەمی
عومەر لە سێ لا ماڵی کاولە
کوردە و مەلایە و زگیشی زلە

## تۆزکاڵێ بە تون

بیر و زا کردن بە ژنی خراو
هۆی رسوایی یە و لێت ئەکا بە قاو
تۆزکاڵێ بە تون لێی بەرزۆکەی دەنگ
رازی دەرونت ئەزڕێنی وەك زەنگ
جوامێری و چاکی لەگەڵ ناسوپاس
هۆی رۆژە رەشی و گوناحە و قەساس

# تیر و نەچیر

بڕێ کەس ئەڵێ دژمنی گیانی
بێ کەڵکە ماوە و، دەرفەت پێدانی
دڵ سوتانەوە بۆ گورگی خوێن خۆر
دەرحەق بە مەڕی فەقیر زوڵمە و زۆر
دژمنێ کە وا ماتڵی هەلە
دەرفەتی نەدەی قازانجی گەلە
کەسێ دژمنی خوێن مژی دڵڕەش
لە ژێر دەستی بێ و نەینێتە ناو هەش
خۆیشی دژمنە ئەگەر نەی کوژێ
هەر بە دەستی خۆی مێشکی ئەپژێ
سەری مار لە سەر بەرد و دەس بە بەرد
دەرفەت پێدانی هۆی ئازارە و دەرد
بەڵام بڕێتر لەم گەل و خەڵکە
ئەڵێن کوشتنی دیلان بێ کەڵکە
تا رون ئەبێتۆ پیسە یا پاکە
لە کوشتنی دیل ماتڵ بون چاکە
ئەو لە کۆیلەی تۆ، دیلە کە وەختێ
واچاکە بیری لێ بکەیتۆ نەختێ
وەختێ بیکوژی بێ قازانج و کەڵك
سەر شۆڕۆ ئەبی لە نێو گەل و خەڵك

بـــار چـــا کــــی کـــارت دەرئـــەچێ لە دەست
هـــەست و مـــەبەستت ئـــەبەسرێن دەربـــەست
بـــێ گیـــان کـــردنی گیـــاندار ئـــاسانە
گیـــان بـــە کـــوژراودان کـــاری کـــێ مـــانە
تـــیر هـــاوێژ کـــاتێ لە دەســـتی چـــو تـــیر
تـــازە ئـــەو تـــیرەی نـــایێتەوە گـــیر
ئـــەو تـــیر هـــاوێژە بـــە بـــیر و ژیـــرە
کـــە هـــەستی لە لای تـــیر و نـــەچیرە
بـــزانـــێ تـــیری بـــۆچ ئەهـــاوێژێ
چـــەنەچیرێکە؟ خـــوێنی ئـــەرژێژێ
وەك عـــومەر نـــەبێ لە چـــاك و خـــراو
کـــەس نەپـــارێزێ و بـــیداتـــە بـــەر قـــاو

## هەرکەسێ ئەبێ رۆڵەی هونەر بێ

زانـــا تـــێهەڵچو کـــە لە گـــەڵ نـــەزان
هـــەر بـــە دەســـتی خـــۆی رێـــزی خـــۆی بـــەزان
ئـــەگـــەر چـــی نـــەزان بـــەزانـــی زانـــا
قـــامکی مـــاتڵ بـــون مـــەنە ژێـــر دانـــا
چـــونکو لە شـــەزی گـــەوهەر و بـــەردا
پـــای گـــەوهەر ئـــەچێ بـــە دزکـــی دەردا

بـــولبولْ و قـــالاْو له قـــەفەسێکا
کـــامیان تیـــا ئـــەچێ له نـــەفەسێکا
دیـــاره بـــۆگـــەنی نـــەفەسی قـــالاْو
ئـــەچنێ له بـــولبولْ هەنـــاسه و هـــالاْو
زانـــا ئـــەکـــێشێ ئـــێش و دەردی لەش
تـــا گیـــانی پـــاکـــی ئـــەچەقێته هـــەش
بـــەبەردی دڵـــرەق شـــەربەری زێـــڕ ئـــەشکێ
بـــەلاْم ئـــەم هـــەرزێڕ ئـــەو نـــاکـــا کـــەشکێ
ســـەرت ســـوڕ نـــەبێ کـــە پیـــاوی زانیـــار
بـــێ دەنگ بـــێ له لای بـــێ شـــەرم و شۆفـــار
له دەنگـــی دەهـــۆڵ دەنگـــی نـــەی نـــایه
چـــونکو ئـــەزانـــێ دەهـــۆڵ رســـوایـــه
هەنـــاسەی نـــێرگس بـــۆی گـــوڵ و رێحـــان
بـــه بـــۆگـــەنی سیر چـــۆڵ ئـــەکـــەن مـــەیدان
نـــەزانـــی مـــل هـــوڕ خـــول ئـــەدا بـــه مـــل
زانـــا گـــیر ئـــەدا بـــه هـــاواری زل
ئـــیتر نـــازانـــێ دەنگـــی نـــەرم و گـــەرم
له زەڕەی دەنگـــی زوڕنـــا ئـــەکـــا شـــەرم
گـــۆرانـــی کـــوردی و نـــەزم و ئـــاهەنگی
بـــێ دەنگـــه لەلای، کەڕەنـــای جـــەنگی
گـــەوهەر هـــەر چـــەندە کـــەوته نـــاو لیـــته
دیســـان گـــەوهەره و بـــه نـــرخ و پـــیته

تـــۆز و گـــەردەلول بگـــاتە ئـــاسمان
لەوێشـــدا تـــۆزە و ئـــازاری چـــاوان
مـــەبەس ئـــەوەیە کـــە مـــەڵبەند و شـــوێن
نـــە تـــامی چـــێشتی رێـــزن و، نـــە خـــوێن
زانـــا بـــە رێـــزە لە ژێـــر خـــاکـــیشا
نـــەزان بـــێ کـــەڵکە لە ئـــەفلاکـــیشا
بـــۆ کـــەسێ بـــیر و بـــاوەڕی پـــاکـــە
هـــەرچـــی تـــێکۆشی بـــە کـــەڵك و چـــاکـــە
ئـــەوەی لە بـــاری بـــیرۆ لە بـــارە
بـــار نەهێنـــانی، لە گـــەڵ خەســـارە
وەلێ هـــەر کـــەسێ گـــێل و ســـەرپل بـــێ
وشك و بـــێ مـــێشك و لە رێگـــە کـــل بـــێ
هـــەوڵ و تەقـــالا نـــایهێنێتە بـــار
زەحـــمەت خەســـارە بـــۆ پیـــاوی لاســـار
بـــەڵێ خـــوڵە مـــێش نـــەتەوەی گـــڕە
چـــون بـــێ هـــونەرە خـــاکـــێکی ســـڕە
شـــەکـــەر ئـــەگـــەرچـــی کـــوڕی قـــامیشە
خـــۆی کـــە شـــیرینە، بـــا مقـــامیشە
کەنعـــان بـــاکـــوڕی نـــوحی نـــەبی‌یە
مـــیوەی هـــونەری نـــیە، دار بـــی‌یە
بـــابی هـــۆی بـــەرزی پـــایەی ئـــەو نـــەبو
بـــە گـــێژی تۆفـــان بـــێ هـــونەری چـــو

بەس ئەبێ هەرکەس رۆڵەی هونەر بێ
تا وەك خەلیلی کوڕی ئازەر بێ
هونەر حەسێوە نە ماڵ و گەوهەر
گوڵ کوڕی دزکە، چاوەکەی «عومەر»
عەتری کە هەوا پڕکا لە بۆی خۆش
کریار بۆ مەتای خۆی ئێنێتە جوش
هەروەها زانایش وەك دوکانی گوڵ
هەر بە هەناسەی وەنەوشە و سونبوڵ
ئارام و بێدەنگ هونەر ئەنوێنێ
لانکەی کۆرپەی مێشك سوکی ئەجوێنێ
بەلامێ نەزان وەکو تەپڵی جەنگ
هونەری نیە نێو خاڵی و پڕ دەنگ

## چەن ئامۆژگارییەك

زانایێ لە نێو کۆڕی نەزانا
وەك پەری وایە لە نێو کوێرانا
دیارە هەرکەسێ چاوی نەبینێ
نابینێ خاڵی گۆنای شیرینێ
یا قورئانێکە لە نێو کەسانێ
کە رێزێ نانێن قەت لە قورئانێ

کاتێ پەیدات کرد دۆسێ بە چەند ساڵ
لە دەستی مەدە بە چەن قسەی تاڵ
لەعلێ بە چەن ساڵ لە بەردێ دەردێ
هۆشت بێ نەشکێ، لە پڕ بە بەردێ
ئەقڵ بە دەستی نەوسۆ ماتە و گێژ
وەك پیاو بە دەستی ژنی زوان درێژ
کاول بێ چاکە مەڵبەند و شوێنێ
کە لەو مەڵبەندە ژن بقیژێنێ
باوەڕی تیژی پیاوی بێ پارە
لە لای ماڵ پەرس چەوێڵ و لارە
رشتەی وتاری وەك مرواری بێ
ئەو ئەڵێ رەنگە جادوکاری بێ
قۆڵی پڕلە هێز بە بێ مێشکی ژیر
هۆی دەردیسەرە بە باوەڕ و بیر
واتە پێویستە ژیری بەر لە زۆر
زۆری بێ ژیری زامێکە ناسۆر
زەڕ و زۆر لە دەس پیاوی نەزانا
سیلاحی جەنگە لە گەڵ یەزدانا
ماڵی خۆخۆری بەخشێنەر بە خەڵك
چاتر لە شێخی نوێژکەری بێ کەڵك
شێخێ نەبەخشێ و نەخوا و جێ بێڵێ
سەری پانۆکە بە کلکە بێڵێ

چـــون وەهـــا کـــەسێ لە مـــاڵی ژیـــنا
تـــووڕێکی نەچـــاند بـــە دەشـــتی دیـــنا
بـــۆ خـــۆنوانـــدن لە بـــەر چـــاوی گـــەل
قـــیت و قـــۆز ئـــەچن بـــە ڕێـــوە زۆر شـــەل
مـــەبەستم شـــەلی دیـــنی کـــەسێکە
کـــە خـــوا ئـــەزانـــێ چـــۆن تـــەرەسێکە
خـــۆراکـــی نـــاخوا و بـــەرگی نـــاپۆشێ
بـــە خەیـــاڵ بـــۆ خـــوا دەکـــا و دەکـــۆشێ
نـــازانـــێ تـــەرکی خـــۆشی بـــۆ ژیـــا
گـــەلێ عـــابیدی لە ڕێگـــە لادا
جیـــا لە دەس دانـــی دنیـــای ژیـــانی
ئیمـــانیشی چـــو بـــە بـــێ ویـــژدانـــی
کـــەسێ بـــۆ ژیـــا بـــوبە گـــۆشەگـــیر
ئـــەوە ڕاوچـــییە نـــیشتە بـــۆ نـــەچیر
یـــاخۆ کـــوێرێکە ئـــەزوانـــێ لە جـــام
تـــا خـــۆی جـــوان بکـــا لە بـــەر چـــاوی عـــام
کـــوێر کـــە نـــایبنێ بـــا تـــا ئـــێوارە
بـــزوانـــێ لە جـــام بـــۆ خـــۆی بێچـــارە

## هەتا یەك نەبێ

لافــاو لە دڵــۆپ زۆریش لە کــەم کــەم
خــەزێنەی قــاڕون لە درهــەم درهــەم
بــە پــەردە وردە تــەیری ئەبــاییل
ڕۆژی کــرد بــە شــەو لە ئەسحـابولفیل
چــەن دڵــۆپێکن دەبــن بــە چــۆمێ
بــەحرێ لە چــەن چــۆم لە چــەن قــوم گــۆمێ
شومــارەی حەســاو تــا هــەرکوێ بــڕوا
هەتــا یــەك نــەبێ نــاکــرێن بــڕوا
قــۆشەن و سوپــای جــەم وکــەی کــەمکەم
لە نــەفەر نــەفەر هــاتونە بــەرهەم
هەمــارێکی پــڕ لە دەغــڵ و لە دان
لە دەنکــە دەنکــە دراوە سـامان
شــەوی دەرد و خــەم کــەمکەم لە عــومەر
دای پــۆشی ڕێگــەی ژیــنی بــێ ســەمەر

## بۆ زانا ناشێ

بــرام بــزانــە بــۆ زانــا نــاشێ
دەغــڵی بهــاژن بــە هــەمو ئــاشێ

نـابێ لە وتـەی دەم لەق بـبوری
واچـاکـە زوتـر دەمـی بـدوری
دەمـی بسـوتێ چـاترە بـێ فـەڕ
تـا لە گ شـوێنێ نـەکـا وەڕە وەڕ
بـە هـۆی پیـاوەتی بـوردن لە سـەر سـوك
بـێ رێـزت ئـەکـا لای گـەورە و بـچوك
تـا دەم کـوت نـەبێ جەنـابی دەم لەق
مـێشکی گـەل ئـەخوا هـەر بە چـەقە چـەق
دەم لەق تـا زاریـێن نـەکـەیتە زاری
بـۆ ئـابڕو بـردن بـەرزە هـاواری
تـا خـۆشتر بـدوی لە گـەڵ دەم لەقـا
ئـەو زیـاتر لە تـۆ ئـەچێ بـە چـەقا

## بە چەکۆ دیل بو

بـۆ هـەمو کـەسێ تـاوان و گونـاح
بـە هـیچ یـاسایێ نـەکـراوە مەبـاح
بـە تـایبەت گونـاح زۆر نـاشیرینە
لە کـەسێکی وا زانـای رێـی دیـنە
چـون چـەکـی زانـین چـەکـێ گـەورەیە
بـانتر لە چـەکـی هـەمو دەورەیـە

چەکێ کە بابی هەمو چەکێ بێ
کەی خاوەنەکەی بۆ دیل بون ئەشێ
خاوەن چەکی وا لە مەیدانی شەڕ
کە بە دیل گیرا پیاوێکە بێ فەڕ
پیاوێکی سەر شۆڕ هیچ لێ نەهاتو
ئەژنۆی نامەردی لە باوەش گرتو
سەرشۆڕترێکە ئەڵبەت لە هەمو
لە نێو دیلانا بە چەکۆ دیل بو
نەزانی بێ زەین چاوکوێری بێ نور
باشترە لە تۆی زانای لە رێ دوور
چونکو ئەو کوێری ئەیکا بە داوۆ
تۆ دو چاوی ساغ ئەتخاتە چاوۆ
گیان بە هەناسە و نەفەسێ بەنە
لە لێژی لەشدا گلۆڵەی بەنە
کە خلارۆ بو ناوەستێ تا چۆم
چۆمیش هەر ئەیبا و ئەیخاتە ناوگۆم
وەختێ کە دنیا یەك هەناسە بێ
نەزانە کەسێ بۆی بە تاسە بێ
خێڵی خۆ فرۆش ساویلکە و سڕن
یۆسف فرۆش و کلاّفە کڕن
کەسێ کە دڵبەر بدا بە پارە
لە شاری ئەقلاّ شێتە و بێ کارە

بەدیهێنەرمـــان فـــەرمویە پێمـــان
پەیمـــان شکـــاندن ئـــەشکێنێ پێمـــان
مـــن و تـــۆ زوتـــر بەڵێنمـــان داوە
یـــۆسفی شـــەرەف نـــەخەینە لاوە
عـــومەر ئـــەزانـــم بـــۆچ وا ئەنـــاڵی
نـــاوسکت رەشـــە و سیـــا زوخـــاڵی
چـــونکو بـــە جـــارێ بـــە وتـــەی دژمـــن
دۆســـتت لە دەس دا بـــۆ تـــیکەی چـــڵکن
پەیمـــان و بـــەڵێن جـــوامـــێریت شکـــان
لە ســـەر بـــاری نـــەوس هـــاتیتە مـــەیدان

## کاسەی دوکەسی

شەیتـــان لە خـــاوەن ئیمـــان کەنـــارە
ئـــەونەی دوری شـــا و پیـــاوی بـــێ پـــارە
نـــوێژنەکـــەر دورە لە شـــەرت و پەیمـــان
وەکـــو کـــەڕ و لاڵ لە قســـە و بەیـــان
بـــێ نـــوێژ بـــە تـــایبەت بـــۆ قـــەرز و قـــۆڵە
هەمـــاری وەفـــای بـــێ دەغـــڵ و چـــۆڵە
قـــەرزی پـــێ نـــادا مـــەگـــەر ســـاویلکە
هـــەرچـــەن لە برســـا کـــەوتە ئـــاویلکە

کەسێ لە فەرزی خودا بێزار بێ
چ خەمێکی هەن بە تۆ قەرزار بێ
بە پوڵ و پارەی قەرزی من و تۆ
کاسەی دو کەسی وا لە پێش ئەمڕۆ
کە داوای لێ کەی بە شێوەی جەفەنگ
وەك مرۆڤێکی سەرگێژ بە هۆی بەنگ
پێت ئەڵێ فەرمو داوەرە ژورێ
لە نێو دو دەستم هەڵقەنە تورێ

## زگی تێر ئاگای لە برسی نیە

هەر دەولەمەندێ رانەخا سوفرە
خزمی موساش بێ قارونی کوفرە
غەزای سەر سوفرەی هەر دەولەمەنێ
بە دەم هەژارۆ کە پێ نەکەنێ
ئەو سوفرە پێستی هەنیەی بەخێڵە
بۆیێ بەو جۆرە نێو چاوی لێڵە
ئەی خاوەن ماڵی خاوەن خورد و خەو
مەی مەینەت مەنۆش بە رۆژ و بە شەو
تۆ ئەونە تێری و ریخۆڵەت پڕە
مەندۆك لە زارت هەر وەکو وڕە

زاری تــۆ تــامی تــاڵی نــەدیوە
مــەستە بــە شــیرەی شــیرینی مــیوە
کــەسێ مــەزەی تــاڵ نــەچێژێ بــە دەم
شــیرینی لە دەم تــاڵە وەکــو ســەم
ئــەوەی کــە دارای کــۆزێ مــنداڵــە
ئــەزانــێ تــرێ تــرشە یــا تــاڵە
رێــبەرەکــانی عــالەمی ئــەوزۆ
بــۆچی گــوێ کــەژن لە نــاڵە و رۆژۆ؟
لە هــەر بــارێکۆ چــون خۆیــان تــێرن
لە واتــەی نــاڵە و رۆژۆ دڵ کــوێرن
یــوسفی مــیسری ســەرۆکــی لاوچــاك
روســوری مــێژو لە ســەر ئــەرز و خــاك
لە هــەر حــەو ســاڵەی گــرانــی مــیسرا
تــێر بــونی زکــی لە کــەس نــەبیسرا
هەتــا لە دەردی بــرسی بــزانــێ
زکــێ دەرمــان کــا بــە لەتــە نــانێ
کــەسێ بــە تــێری عــومری بــردە ســەر
چــوزانــێ دەردی بــرسی و دەربــەدەر
کــەی حــاڵیە لێــی بــرسیەتی چــیە
(زگــی تــێر ئــاگــای لە بــرسی نــیە)
مــاری هــەژاری کــەسێ نــەگــازێ،
نــازانــێ ژانــی دەردی نــاسازێ

کەسێ دەناسێ قۆرتی نەداری
چوییتە چۆڵگە و شیوی هەژاری
ئەی ئەوەی سواری لە ئەسپی مراد
تون تاوی ئەدەی سەرخۆش و دڵ شاد
نەختێ لە سەرخۆ لاکە بە دواوە
کەری کۆڵکێشێ لە قوڕ چەقاوە

## مرۆڤی وشیار

ئاگر لە ماڵی جیرانی هەژار
قەت داوا ناکا مرۆڤی وشیار
چونکو دەزانێ ئەو مژ و تەمە
لەو ماڵە هەموی دوکەڵی خەمە
یاخۆ دوکەڵی دەردی دەرونە
کزەی کەبابی جەرگی زەبونە
مرۆڤی وشیار لە ساڵی قاتی
ناڵێ بە هەژار بۆ کز و ماتی
مەگەر بەو مەرجەی دەواکا دەردی
سوری کاتەوە دو کولمی زەردی
بارێ ببینێ چەقیێ لە قوڕ
تێپەڕ نابێ لێی خێرا گورج و گوڕ

وەکــو بــاری خــۆی چــەقیبێ لە گــڵ
دەیــهێنێتە دەر بــە گیــان و بــە دڵ
عــومەر تــامەزرۆی ســەربەرزی گــەلە
هــەر چــەن خــۆی دو پــێی عــەمەڵی شــەلە
هــەرچــەن نــەی نــەوی جــاریێ لە بــاری
وەلێ هــەنگێزی داوە بــە زاریێ

# وجاخی رون

هــەرچــی رۆژی بــێ ئــەبێ بــخوریێ
زۆر وکــەم بــونی بــە کــەس نــاکــرێ
تــەمەنی کــەسیش کــەم و زۆر نــابێ
پســپۆر بــێ یــا گــێل گــەدا یــا شــا بێ
لە بــنج و بێخــا زێــوەری ئــەزەل
نەخشــاندی بــاڵای ژیــان بــە ئــەجەل
گــەلێ ئــەجەلی ئــەمل بــێ وەك ژیــن
لە رەخــنەی دژمــن دەکــریێ پــەرژین
لاوێ کــۆرپەی مــەرگ لە بــاوەش بگــرێ
وەك بــۆ ژوان چــون بــۆ ژیــان بــمرێ
ئــەو لاوە لاوی زازا و بــابانە
وجــاخی رونــی کــورد و گــۆرانــە

# بای ئەجەل

ئەو ڕۆژەی قەڵەم نوکی دادریا
هەرکەس بەشی خۆی بۆ دیاری کریا
بەگوێرەی یاسای بۆ دیاری کراو
بەشی هەر کەسی هێنایە حەساو
نە خاڵێکی کەم لە پەنای خاڵێ
نە بەرزە فڕی هەڵۆ بە داڵێ
نەگۆشتی واشە بۆ چۆلەکە وکەو
نەگرشە و ورشەی ڕۆژی دا بە شەو
نە بە نوکە نوك ئەبەخشێ نیسکێ
نە بە هەنیسکێ دەزێسێ تیسکێ
دەبێ هەروا بێ یاسا یاسایە
نوسراوی یاسای گەردون ڕەوایە
کەسێ وەکێڵی بۆران و بایە
گوێ کەڕ لە ناڵە وگریە و هەرایە
ئەویش نوێنەرە بۆ ئەمری گەردون
چرای پیرێژن ناگرێ بە تون
ئەی تاسە خواری هەردەی زێڕو زیو
ڕێبواری ڕێگەی خەم و دڵ پەشێو
ئاکامی ژیان کاتێ مردن بێ
دڵخۆشی نابێ بە کۆ کردن بێ

بــۆ تــاقە زكــێ خــۆت مــەخە هــەچەل
چــی بــەشی تــۆ بــێ لێــی نــا كــرێ كــەل
ئــەی زگــار بــە هــۆی زریكــەی مــردن
خــۆ خــلاوینەر بــە دەرمــان كــردن
بــای ئــەجەل وەختــێ دای لە گــەڵا و بــەرگ
هــەر ئــەو دەرمــانەت لێ ئــە كــاتە مــەرگ
تــا ئــاخر تــیكە و تــنۆكــە ئــاوێ
نــێوی تــۆی لێ بــێ مــردنت نــاوێ
وەلێ پــێوانــەت دەڕژێ كــە پــڕ بــو
دور دەبــێ لەوەی لە دەورت خــڕ بــو
هــەر وەكــو كوتمــان هــەوەڵین پــێنوس
بــۆ هــەمو كــەسێ بــۆتە چــارەنوس
كــە رۆزیت نــەبو لە قــوڵكە ئــاوێ
لە هــەزار مــاسی یــەكت بــۆ نــاوێ
یــا ئــەگــەر مــاسی ژیــانی مــابێ،
لە ســەر وشكیشــا مــەرگی بــۆ نــابێ
بێچــارە پیــاوی كــوێلەی زێــڕ و مــاڵ
بــە رۆژ و بــە شــەو حــەوتە و مــانگ و ســاڵ
بــە شــوێن رۆزی دا هــەر پــا لە دەوە
نــازانــێ مــردن لە شــوێنی ئــەوە
هــەرچــی كــە بــۆ تــۆ دانەنریــابێ
وەكــو هــەر نــەبێ دەسگــیرت نــابێ

وەلێ کــە بــەدی هـــاتیێ بـــۆ تـــۆ
لە بـــن گۆمـــا بـــێ یـــا لە ســـەر ئـــاسۆ
جیـــا لە تـــۆ کـــەسێ لە مـــاڵی بـــونا
لە شەوگـــاری رەش یـــا رۆژی رونـــا
کـــەڵکی لێ نـــابا هـــەر وەکـــو نـــەبێ
جـــا خەرمـــانێ بـــێ مســـتێ یـــا حـــەبێ
بـــیستوتە چـــەندە بـــۆ ئـــاوی ژیـــان
ئـــەسکەندەر چـــێژای ژەهـــری تێکۆشـــان
کـــە گـــەیشتە جـــێ ئـــاوێ نەمـــابو
حـــەزرەتی خـــدر هـــەڵی لوشـــا بـــو
دەمـــێکە مـــنیش کـــۆلیلم وەك ئـــەو
ئـــەو بـــۆ ئـــاوی ژیـــن مـــن بـــۆ ئـــاوی خـــەو

## عەبای موسا و ریشی فیرعەون

مـــاڵداری بـــێ کـــەڵك جـــوانـــە بـــە دیـــمەن
بـــەڵام بـــە مـــانا قـــوزێکە بـــۆ گـــەن
بـــێ مـــاڵی ســـەخیش رێـــبوارێ جـــوانـــە
کـــە تـــۆزی رێگـــەی لە رو پەخشـــانە
ئـــەو ریشـــی فـــیرعەون بـــە گـــوڵ رازاوە
ئـــەم عەبـــای موســـای پـــینە کـــراوە

ئـــەم کـــەم کـــەم لە رو لادەچـــێ تـــۆزی
ئـــەویش دەبـــینرێ دیـــمەنی بـــۆزی
واتـــە هەتـــا ســـەر ئـــەم بـــێ مـــاڵ نـــابێ
ئـــەویش تـــا ئـــاخر لە ســـەر حـــاڵ نـــابێ
مـــاڵداری بـــێ خـــێر نـــاحەوێتەوە
هـــەر هەنگـــاوی خـــەم هـــەڵدێنێتەوە
وەکـــو لەم دنیـــا کـــۆیلە و زگـــارە
ســـاڵی مـــەرگیشی هـــەر بـــێ بەهـــارە
بـــاڵێی حـــاڵێ بـــێ خـــەبەر داریکـــە
رۆژی حـــەشریشی هـــەر وا تـــاریکە
شـــوێن و رێـــزێکی لەو مـــاڵ و شـــوێنە
نـــیە، هـــەر بـــەشی لەعـــنەت و جـــوێنە

## بەخیێڵ

نـــێو چـــاوی بـــەخیێڵ چـــاوانـــەی دەردە
دەرونـــی کـــانگای هەنـــاسەی ســـەردە
بـــە ســـەر بـــەرزی گـــەل کـــز و ســـەر شـــۆڕە
لە بـــەحری خەمـــا دڵـــی پـــاپۆڕە
بـــە تـــێری و ســـاغی مـــەردوم نـــەخۆشە
ئـــاشتی خـــواز نـــیە چـــون شـــەڕ فـــرۆشە

ئەگەر بەرگرێ باخی هیوایێ
هاکا لە داخا کوێرایی دایێ
مێشك پوچێکی بەخێڵم بینی
پۆشا بوی جلی مرۆڤی دینی
کوتم هەی کابرا جەحانم لە خۆت
خێڵی دینداران دەسوتن بە هۆت
ئەم ریش پەشم و کەشم و فیشاڵە
ئەم جبە و عەبا و چەفتە و حەکاڵە
هیچێ کە لە تۆ ناکاڵێتەوە
ئابڕوی ماباقیش دەماڵێتەوە

## هۆنراوەی قین

بە خێڵی زەخمێ قوڵ و ناسۆرە
عەرزێکە قاقڕ هەر دڕوی زۆرە
ڕەوشتێکی تر وەکو بەخێڵی
ئەستێرەی مرۆڤ ناخاتە لێڵی
ئەوەی کە دارای وا ڕەوشتێکە
بەری لە دنیا و دین و گشتێکە
ئیتر تۆ بە لای بۆ داوا مەکە
ئەو شەوە، داوای خۆراوا مەکە

ئـەو کـە دەرونــی مــژ و دوکــەڵە
دژمــنێ گــەورەی وەك خــۆی لە گــەڵە
پـێویستی نــیە تــۆ رقت لێ بــێ
تــا خــۆی دژمــنێ وایــە لە پــێ بــێ
بــەخێڵ هــۆنراوەی قــین و خەســارە
شەوگــاری رەشــی کــۆسپە و پــەژارە
ئـەوەندە بــاری قــورس و گــرانــە
بــە دەم ژمــارەی ســوك و ئــاسانە
هــەزارێ وەکــو کــۆلیلی دامــاو
یــەك لە هــەزاری بــۆ دێــتە حەســاو

## چەن مەبەستێك

فــێر خــوازێ نــەبێ ئــەوینی فــێربون
دیــارە بــێزارە لە تــوشی خــێر بــون
هــەر وا عــاشقێ بــێ پــارە و دراو
خــۆی دەســوتێنێ مــفت و بــێ حەســاو
دیســان رێــبواری گــێژ و نــەزان حــاڵ
وەك بــاڵدارێکــە نــەبێ پــەڕ و بــاڵ
زاهــیدی نــەزان خــانوی بــێ دەرە
زانــای بــێ کــردەش داری بــێ بــەرە

گـــەلێ رونـــاکـــە ئـــایەتی قورئـــان
حـــەق نـــاردویەتی بـــۆ رێ پیشـــاندان
بـــۆ بـــار هێنـــانی هـــەموان بـــە یـــەك رەنگ
نـــەك بـــۆ بـــالۆرە بـــە نـــەزم و ئـــاهەنگ
بـــە خشـــڵی زانـــین لەشـــی کـــردەوە
هـــەر وەك دەزانـــین، دەڕازێـــتەوە
کـــە وابـــو کـــەسێ نـــەخوێندەوارە
بـــوکی کـــردەوەی کـــز و شڕبـــارە
چـــونکی رێگـــەی دیـــن درێـــژ و دورە
وەســـیلەی ســـواری گـــەلێ زەرورە
نـــەزان لەم رێ دا ســـواری دو پـــایە
بـــۆیە کەمتریـــان دەگـــەن بـــە پـــایە
زانـــای تـــەمبەڵیش گـــەرچـــی ســـوارە
بـــاری کـــەوتوە، بـــە هـــەزار بـــارە
تـــاوانبـــارێکی پەشیمـــانۆ بـــو
چـــاترە هەتـــا نـــوێژ خـــوێنی بـــەدخو
شـــێخێ کـــە نـــاخی دڵـــی ریـــا بـــێ
نـــوێژ و کـــڕنۆشی بـــە هـــیچێ نـــایێ
پیـــاوێکی ســـاکـــار بـــێ ئـــازار و ئـــێش
چـــاترە هەتـــا زانـــای خـــۆ هـــەڵکێش
هـــەر وا مـــرۆڤی نـــەزان و بـــێ زۆر
چـــاترە تـــاکـــو زانـــای مـــەردوم خـــۆر

پرسیا لە کەسێ ئەم نیکتە وردە
وەکو چی وایە زانای بێ کردە؟
فەرموی ئەو کەسە وەك هەنگەژاڵە
هەر پێوەداین دەزانێ خاڵە
بە شەنگە سورە بڵێن هەتا کەی
هەنگوینت نیە و هەر پێوە دەدەی؟
پیاوی بێ خیرەت لە ژن کەمترە
شێخی تەمەحکار چەتە و رێگرە
مەبەستم لە ژن ژنی نەفامە
ئەینا ژن دارای رێز و مەقامە
ئەی لە خۆ ئاڵێن کراسی سپی
بۆ خۆ نواندن ئارام و کپی
هەرچەن بە دیمەن سپی وەك شیری
بە دڵ و دەرون رەش‌ترلە قیری
بۆ ئەوەی سڵت لێ نەکا نەچیر
خۆت مەلاس داوە وەکو گورگی پیر
هیچ نیە کەوا و لفکە و میزەرە
دەس کۆتا هاتن لە شەڕ هونەرە
دەستت کولۆکە لە ئیشی بەتاڵ
بە هیچێ نایێ درێژی قۆڵ و باڵ
هەرچەندە «کۆلیل» بە کردە گێژە
تۆ لێی وەر بگرە ئەم وتو وێژە

# دوکەس

دو کـــەس بـــە خـــەمێ دەتـــاوێنەوە
تـــاوێ بـــە تـــاوێ، دەهـــاوێنەوە
یـــەکـــەم توجـــاڕێ بشکـــێ پـــاپۆڕێ
قـــولایی دەریـــا بـــبێ بـــە گـــۆڕێ
بـــەرهەمی هـــەوڵی ژیـــنی رابـــردوی
بـــڕوا هـــەر وەکـــو عـــومری بـــا بـــردوی
دوهـــەم ئـــەوکـــەسەی بـــبێ بـــە هـــاوەڵ
لە گـــەڵ کـــۆمەڵێ زك زل و دەغـــەڵ
مـــیراتـــی گـــەنجی قـــاڕونی هـــەبێ
هـــەر وەك ئـــەوەیە کـــە هـــیچی نـــەبێ
چـــونکی خـــێڵێکی چـــڵێس و دزن
رێـــبەری شـــەڕ و نـــوێنەری قـــڕن
ئـــەونە زۆر خـــۆر و زەلام و زڕن
مـــاڵ و ئیمـــان و نـــانی دەبـــڕن
هـــۆنراوەیـــێکی پـــڕ لە مۆژگـــاری
مـــەتەڵێ بـــاوە لە کـــوردەواری
«کـــەسێ رەفـــیقی قـــەڵەننەری بـــێ
لە ریش و ســـمێڵ بـــا بـــێوەری بـــێ»
واتـــە هـــاوەڵی لە گـــەڵ بـــێ حـــەیا
نیشـــانەی مـــێردی و پیـــاوەتی دەبـــا

لە گەڵ قەڵەندەر هەتا هاوەڵی
دەبێ ماڵەکەت بەش کەی لە گەڵی
یا مەچۆ لە گەڵ کراس شینی دز
یا رێز و زێڕت هەر دو ئەبێ قڕ
یا مەگرە بە دۆس دەسبڕ و جەردە
یا دەس لە تەمای ئابڕو بەردە
ئەبێ کە دەرکی دۆستی فیلەوان
دەمی زەلام بێ و درێژ و بەرپان
پیرێ دڵ ژیرێ فەرموی بە «کوٚلیل»
دۆستی ئەم دەمە فیل ترە لە فیل

## سفرەی دەوڵەمەند

خەڵاتی خەڵکی خۆشەویستە بۆت
وەلێ نە ئەونەی کەوا کۆنەی خۆت
سفرەی دەوڵەمەند پڕ بێ لە پێخۆر
لە گۆشت و پلاو لە خۆراکی زۆر
قەزای لەتێ نان کەزە کیفاوی
وەك بەردە زێڕە سوتابێ چاوی
لەو هەمو گۆشت و پێخورە کەوێ
کەسەر لە حەنای کەسەر دەخەوێ

بە ژەهری مار بێ گۆشتی بەرخۆڵە
کە بۆتی دانێن بە خوتە و بۆڵە
چێشتی تەڕەماش سرکەی ترش و تاڵ
لە دەس ڕەنجی خۆت هاتیێتە ماڵ
هەزار قات نان و پێخۆرێ دێنێ
کە سەر بە خۆییت لە دەس دەربێنێ

## پرسیار و باس

دەرمانێ مەخۆ تاکو نەزانی
بۆ چە دەردێکە، ئەینا نەزانی
تەنیا و نابەڵەد لە ڕێ و شەقامێ
مەڕۆ، نەك ڕێگەت بگرێ نەفامێ
دیارە نابەڵەد، دڕك و داڵی ڕێ
هەر وەکو مار و ڕێگر، دەیگەزێ
قەت عارت نەبێ لە پرسیار و باس
چونکو بۆ زانین پایەن و ئەساس
عەرزی ئیمامی غەزالییان کرد
ئەم گ زانینەت لە کوێوە هاورد
فەرموی هەرچێکم نەزانی پرسیم
لە فێر بون تێر بو تا مێشکی برسیم

نەخۆشێ ساغۆ بونی هیوا بێ
ئەیێ کە دوکتۆر سەرنجی دابێ
رو زەردی پرسیار رێ پیشاندەرتە
لەو رۆژەی تاجی زانین لە سەرتە
بەلاّم بڕێ شت کە دوا پلەی کار
رون ئەبێتەوە، نایەوێ پرسیار
بە تایبەت کەسێ گەورە و رێبەرە:
وەها پرسیارێ بۆ ئەو زەرەرە
حەزرەتی لوقمان زانای بە نێو بانگ
لەگەڵ داوودا هاوەڵ بو چەن مانگ
هەر چەن دەیبینی ئاسن وەکو مۆم
بە دەستی داوود دەبێ لار و کۆم
تەنانە جارێ پرسیاری نەکرد
وەلێ دەیڕوانی بە سەرنجێ ورد
ئاخری تێگەیشت داوود لە ئاسن
زرێ دەتەنێ بۆ شەڕی دژمن
عومەر زۆرێکی پرسی لەم و لەو
وەلێ لە جواوا خۆیان کردە خەو

# هاوەڵی نەزان

لە گەڵ نامەردان مەچۆ بە رێوە
با پێوە نەبی بە سەر و پێوە
هات و چۆلە گەڵ ئەو نامەردانە
دەس لە ناموس و حەیا بەردانە
هەر چەن بە دور بی لە کرداری وان
هەر بە نێو بانگی بە هاوکاری وان
لەو جێ ئەوانن پێویستە دوری
تا ملکی رێزت نەشکێ سنوری
یا بۆ خێرێکیش بچیە ئەو شوێنە
ئەوانەی لێ بێ، پاداشت جوێنە
یا بۆ نوێژ کردن بچیە مەیخانە
بە تانە دەدرێ چاوت، بە تانە
تۆش لە تاقمی ئارەق خۆرانی
جێ تەوانجی تاڵی کورد و گۆرانی
هەتا هاوەڵت هەتیو مەتیوە
شاگولی رێزت سیسە و وەریوە
داوای مۆژگاریم لە زانایان کرد
وتیان هاوەڵ بە لە گەڵ ژیر و ورد
هاوەڵی نەزان هەڵمەبژێرە
نەزان بێ زەینە و لە دڵدا کوێرە

زانـــا بـــێتە هـــاوەڵی نـــەزان
سـوکە و بـێ بـایەخ وەك تـۆزی بـانان
مـادام هـاوەڵی ئـەتۆش نـەزان بـێت
ئەتکـا بـە کـەرێ بـار بکـێشن پـێت
جـا خـوا نـەخواسـتە تـۆش ئـەگـەر وەك ئـەو
نـەزان بـێ، ڕۆژت ڕەشـە وەکـو شـەو

## تاقەتی وشتر

تـاقەتی وشـتر مـەسەلێ بـاوە
بـە کـانگای سـەبر نـێوی بـراوە
ئـەگـەر مـنداڵـێ بگـرێ هەوسـاری
لا نـادا لە رێـی فەرمـانبەرداری
سـەرپێچی نـاکـا لە دوا کـەوتنی
سکـاڵای نـیە لە نـەسرەوتنی
ئەمـما کـە بـێتو مـنداڵـی نـەزان
بیبـا بـۆ شـیوی مـردن و نەمـان
لێـرە دا وشـتر خـاوەن هەوسـارە
ئـیتر لە سـەبر و تـاقەت بـێزارە
فەرمـانبەرداریش سـنورێکی هـەس
هەوسـاری بـە زۆر دەردێـنێ لە دەس

وەختێ کە هاوژێ گێژ و نەفامە
حەوسەڵە و تاقەت کارێ حەرامە
مەبەس ئەوەیە مرۆڤی بێ مێشك
تاقەتی سەبریش دێنێتە باوێشك
بە تایبەت لە گەڵ دژمنی گیانی
زۆر ناشیرینە شیرین زمانی
دەرمانی زامی کرمۆڵی یاران
دەزانن چیە؟ کاڵەکە ماران.
خاکێ بە لە ژێر دو پای دڵ نەرما
خاك بە لە چاوی پیاوی بێ شەرما
بە خۆشی و نەرمی مەدوە لە گەڵ دز
تا رێزت نەچێ بە تالآن و قرز
خۆت مانو مەکە لە گەڵ ناکەسان
تێخی ژەنگاوی مەدە لە هەسان
چونکا فلیزێ دڵی پوابێ
لە ژەنگی خۆیا گیانی سوتا بێ
بە بیری کۆلیل هەسانی ناوێ
بۆ عیبرەت گرتن چاکە هەروا وێ

# شانێکی شیرین

ئەوا شانێکی شیرین و پڕ ناو
پێشکەشە بە تۆ برای شۆڕە لاو
کەسێ رێ بگرێ بە وتاری خەڵك
مەڵێ زانایە، نەزانە و بێ کەڵك
با دەکاتە خۆی گۆیا بە خەیاڵ
دەبێتە خاوەن خاڵ و باڵ و حاڵ
بە کوردی پەتی دەپسێنێ پەتی
بۆ بارەکەڵای سەر و پێ پەتی
هەزار ماشەڵڵا چ پسپۆڕێکە
بلیمەتی وا لە کەم کۆڕێکە
بەڵامێ هەر بەم خۆ پیشاندانە
ئاقڵ دەیناسێ چەندە مل پانە
زانا کەسێکە تا نەپرسی لێی
بە شەمی پرسیار دانەگرسی لێی
وەڵام نەداتۆ نەك وەك دەم بە تاڵ
روی قسەی رەش بێ چون مەشکە بە تاڵ
نەزان لە مەجلیس ئەیکا بە گاڵە
چونکا بێ مێشکە و دەمی بەتاڵە
دەمی شل ئەبێ و کەس گوێی پێ نادا
ئەو باکای قسە هەر با بە با دا

لە بـن ژانـمدا بـرینێ چـاو زەرد
سەرتـاپای لەشـی هێنـابو بـە دەرد
خـوای لێ رازی بـێت بـاوکم، بـەو بـۆنە
گ رۆژێ دەیکـوت زامـەکـەت چـۆنە؟
جـارێ نـەپرسی جـێگەکـەی کـوێیە؟
زانـیم مـەبەستی دەرسـێکی نـوێیە
واتـە کـە نـێوی هـەمو ئـەندامـێ
بـۆ کـوتن نـاشێ لە هـەر مەقـامێ
قسـە لـەدڵدا لـێك بـدەرەوە
ئـانجا بـۆ وەرام دەم بکـەرەوە
دیـارە ئـاکـامی قسـەی سـارد و سـڕ
یـێخەی خـاوەنی ئـەکـا شـڕ و دڕ
تـا بـاش نـەزانـی کـوتن رەوایـە
مـەڵێ بـا نـەڵێن دەم بـەڕەڵایە
وتـاری راسـتو رۆشـنییـرانـە
بـا گـیـریشتدا لـەبـەندیـخـانە
گـەلێك چـاترە تـا بـە درۆی زل
کـۆت و زنـجیرت لابـەرن لە مـل
وەلێ لێـم بـزرە بـۆچی لەم عـەسرە؟
قـیمەتی درۆ، تـەلار و قـەسرە
بـۆچ راسـتە قـینە سـرتەی لێ نـایە
قـاڵورەی درۆ، هـەر وەك زوڕ نـایە؟!

# شەش و بێش

راستی چون باسی درۆ هاتە پێش
شەشدەر خاڵییە و کاتی «شەش»ە و بێش
دەرفەتە مۆرەی بیرم لە تاخان
بێنمە نێو ماڵی دەلەسە و چاخان
دەڵێن بناغەی درۆ سەهۆڵە
بنی هولۆڵە و داریٚ کرمۆڵە
شوێنی برین و، جێی گولەی بڕناو
دوای ساڕێژ بونیش هەر ئەداله چاو
دەلەسە و درۆش زامێکی وایە
شوێنی دەمێنیٚ هەتا، هەتایە
کوڕانی یاقوب بە بیٚ بنیامین
کە چون بۆ میسر بۆ گەنم کڕین
هەر بە سەرنجیٚ یوسف ناسینی
هاتەوە بیری ژینی مێژینی
لە پاش پرسیار و وەڵامێکی زۆر
جەنابی یوسف فەرموی بە هەر جۆر
بۆ جارێکی تر هیچ نادەم پێتان
ئەگەر بنیامین نەبیٚ هاوڕێتان
بابیان کە بیستی ئەم قسە و باسە
فەرموی ڕۆڵە گیان ڕەنگە وەسواسە

رێ نوماتان بێ، بکەن کارێتر
خۆ ئەمتانە کرد ئێوە جارێ تر!!
هێشتا داخێ تر، لە سینەمایە
پەردەی فیلمێ تر لەو سینەمایە
دڵم بە دوری یوسف برژاوە
چوارچێوەی لەشم هەموی چرژاوە
با هەر بەو خەمە سەر بنێمەوە
بە زامێکی نوێ نەکولێمەوە
هۆی بێ باوەڕی تێفکرە چی بو
جارێتر لەوان دەلەسەی دیبو
ئەوان جارێتر درۆیان دابو
شوێنەوارەکەی هێشتا هەر مابو
کەسێ رەوشتی راستی و پاکی بێ
رچە و رێبازی خێر و چاکی بێ
جارێ درۆشی با دەرچێ لە دەم
کەس بە درۆزن نایدا لە قەڵەم
وەلێ کە ناوی بە درۆ دەرچو
سەد راستیش بێژێ تازە بە سەر چو
«عومەر» هەموکەس ئەمەی بیستووە
ئەمما بە گوێچکەی کەم کەسا چووە

# هەوێنی بون

ئینسان هەوێنی هەویری بونە
ئەو نەبێ هەموی بەرەو تیا چونە
گەلاڵەی هەستی وەختێ پوختە بو
گشتی دایەرەی ئەو یەك نوختە بو
خوا فەرمویەتی رێزمان لێ ناوە
زیاد لە هەمو شت هێزمان پێداوە
هەر لە خۆرنشین هەتا خۆر هەڵات
هیچێ بە روتبەی ئەو خاڵە ناگات
لە لایێ ترۆ لە نێو ئەو گشتە
لە نێو ئەو هەمو ورد و درشتە
سپلۆتێکی‌تر وەکو سەگ نیە
کورۆکی پەستی و بێ ژیواریە
بەڵام چون سپلۆت خەریکی پاسە
باشترە لەوەی نمەك نەناسە
سەگێ سەد کەڕەت بە دار بنێی راو
تیکە ناتێکی هەروا لە بەر چاو
لە بیری ناچێ ئەو تیکە نانە
خۆزگە وا دەبون هەرچی ئینسانە
قامکێکت شیر بێ یەکێکت شەکەر
بینێیتە نێو دەم سپڵەی بێ هونەر

حـــەتمەن دەیگـــازێ کـــاتی دەرهێنـــان
جـــا ســـەگ چـــاتر بـــو یـــا بـــڕێ ئینســـان
ســـپڵەی نـــاسوپاس چـــاکـــەی حەفتـــا ســـاڵ
بـــەر چـــاوی نـــایە وەك دەنکـــێکی گـــاڵ
«عـــومەر» چـــون کـــردی خـــزمەت بـــە نـــاکەس
دیـــنیشی وەکـــو دنیـــا چـــو لە دەس

## تەمبەڵ

فـــێر بـــون لە گیـــانی تـــەمبەڵ حـــەرامـــە
بـــێ بـــەش لە رێـــز و روتـــبە و مەقـــامە
بـــەزەییت نـــەیێ بـــە گـــای قـــەڵەوا
چـــون هـــەر وا لە بـــیر خـــواردن و خـــەوا
کـــەسێ وەکـــو گـــا قـــەڵەوی دەوێ
وا چـــاکـــە چـــەقۆی تـــیژی وێکـــەوێ
بـــۆ خـــاتر ورگـــی کـــەری بەریـــارە
خـــاوەن کورتـــان و هـــۆز و هەوســـارە

## حیکمەت

لە نێو ئینجیلا ئەم نیکتە جوانە
پێشکەش بە گیانی بەرزی ئینسانە
دەڵێ ئەی رۆڵەی ئادەمیزادە
بە چ بارێکا دێیتە سەر جادە
وەختێ کە ماڵت دەنێمە ژێر دەس
کەماڵت دەوێ بە هەوا و هەوەس
کاتێکیش ماڵت نەبێ پڕ خەمی
گزکز دەنیشی بە هۆی بەش کەمی
کەوا بۆ ئیتر چ کات و وەختێ
خەریکی یادی من ئەبی نەختێ
بەینێ بە نازی خۆشی دەنازی
بەینێکیش بە هۆی تاڵی ناسازی
بە خۆشی و تاڵی ئەمە حاڵتە
کەی بیرت لە لای ئاخر ماڵتە

## لوتفی خوا

تاقە یەزدانە فەرمەندەی گشتە
بون و نەبونی هەر دو لە مشتە

یەکێ لە سەر تەخت دێنێتە خوارۆ
سەری دەکاتە پەتی سێدارۆ
حوسەینێ شەهید دەکا بە شمرێ
دەبێ کە یەحیاش بە تێغێ بمرێ
لە نێو سك ماسی بە هۆی ئەمری ئەو
یۆنس خاوەنی هەناسەیە و خەو
سام و هەیبەتی ئەوەندە بەرزە
پێغەمبەرانیش دێنێتە لەرزە
کە خۆری لوتفی دەرخا تۆزقاڵێ
تاریکی تاوان نامێنێ خاڵێ
لە بەر هەتاوی ئەو خۆرە گەرمە
دڵ لە هەناسەی شەرما بێ شەرمە
بە تێ خوزێنێ تون لە مەحشەرا
ئەنبیاش سەریان دەخەنە بەرا
ئەوندەی زەڕڕە و باڵە مێشولە
دەنگێ لە زێڕی کەوای پەپولە
لە ڕێگەی لوتفۆ بداتۆ ئاوڕ
سەریان هەڵدێنن جولەکە و گاوڕ

# ملەمل مەکە

کەسێ لەم دنیا نەگرێ ڕێگەی چاك
بە ئاوی ئیخلاس خۆی نەشواتۆ پاك
ڕۆژی ئاخری کەبێ، ئاخرە
هاوەڵی گڕ و پشکۆی ئاگرە
وتەی خودایە وا لە نێو قورئان
لە ڕۆژی مەحشەر دەچێژم پێتان
دەغەز و دەردی قرچە بە دڵ خەر
هەرێمی خۆشی لە ریشە هاوەر
دەردێکی گەورە نەك هاسان و سوك
عەزابی دنیای لە لا تەسك و چوك
وتەی زانایان مۆژگاری و پەندە
کێ نەیگرتە گوێ گەندەڵە و گەندە
ئەوانەی کە وا پیتۆڵ و چاکن
بە ئاوی پەند و مۆژگاری پاکن
ئاقل کەسێکە وتەی پێشینان
بگرێتە گوێچکە، تا ئێمە و مانان
ئەو گوێ گرتنە لە قسەو باسا
بۆ پاشماوەی گەل بکەینە یاسا
کەسی نەبیسێ مۆژگاری گەورە
پێی دەبیسێنێ زەمانە و دەورە

دزێ لە دزی دەس کوڵ نەکاتۆ
تۆڵەی زەمانە دەستی دەباتۆ
مەلێ کە دیتی ملی بە داوۆ
تەماحی دانە دەنێتە لاوۆ
تۆش کە مرۆڤی، وەکو ئەو مەلە
ملە مل مەکە لەگەڵ ئەم گەلە
پەندێ وەربگرە راپەڕە لە خەو
با نەبیتە پەن لە لای ئەم و ئەو
«کۆلیل»م بۆ تۆ هەڵبژرکاوم
پەپولەی بۆ تۆ دو باڵ سوتاوم

## لە چاوی عاسمان

فرمێسکە و رێژنە لە چاوی عاسمان
تا عەرزی هەزار نەمرێ لە تینوان
دەس بە ناڵین و گریە و شین دەکا
ئاوی چاوانی لێ ئاژین دەکا
عەرزیش لە باتی ئەم ئاو دێرییە
چون رەچەڵەکی خوڵی کوێرییە
بە گێژەڵوکە کوێر دەکا چاوی
لە گۆزە دەتکێ چی وا لە ناوی

بەڵێ سرشتی سەخی، بەخشینە
با تۆ تاڵیش بی ئەو هەر شیرینە
سەخی فریشتەی بێ ژیوارانە
بۆ کێڵگەی دەغڵی هەمو، بارانە
سەدکەڕەت بگری ڕێگەی بێ خێری
ئەو هەر خاوەنی هەستە و جوامێری
خوا کە ساحێوی هەستی تەواوە
تاوان دەپۆشێ بە هۆی سەخاوە
بە چاو دەبینێ خراپی و تاوان
هێشتا کەسێکیش ناکا دەسنیشان
بەڵامێ ئێمە هیچیش نابینین
چونکی سەر تەڵی تاوان و قینین
دەیکەینە هەرا و بانگ و قاوە قاو
وەك وەحشی ڕێزی خەڵکی دەکەین ڕاو
سپاس بۆ یەزدان کە چاومان کوێرە
لەو کردەوانەی نهێنی و ژێرە
داخوا من و تۆ چۆن دەماندا تەل
بمان زانیبا لە نهێنی گەل
سوێندم بە یەزدان مرۆڤ و پەری
لە شەڕی ئێمە نەدەبون بەری

# رەشەبای مەرگ

زێـــڕ وەدەردێـــنن بـــە کـــەندن لە کـــان
لە دەس بـــەخێڵیش بـــە گیـــان دەرهێنـــان
ئـــەوەن بـــۆ پـــارە، چـــوختی و نـــۆکـــەرن
لە هـــەر کـــوێ نـــاوی پـــارەدار بـــەرن
دەڵـــێن پـــێویستە ئـــێمەش تـــێکۆشین
تـــا جـــلی زێـــڕی ئـــەوان دەپـــۆشین
هـــەر پـــوڵ و پـــارە هـــیوا و مـــەبەستە
بـــێ پـــوڵ و پـــارە بـــێ دەســـتە و، دەســـتە
بـــێ پـــوڵ و پـــارە بـــزرین لە نـــێوا
زبـــرین لە بـــەر چـــاو تـــریفەی زێـــوا
خـــواردن هـــیچ نـــیە دەردەچـــێ لە دەس
بـــا نێومـــان بـــێ لای بێگـــانە و کـــەس
ئـــیتر نـــازانـــێ ڕۆژێ یـــا شـــەوێ
وەبـــەر ڕەشەبـــای مـــردن ئـــەکـــەوێ
بـــە ئـــاخ و داخـــۆ گشـــتێ جـــێ تـــێلێ
دژمـــن مـــەزرەعەی هـــیوای دەکـــێلێ
خەرمـــانی هـــیوای «عـــومەر» وەخـــتێ مـــرد
چـــەن هـــەڵبەستێکە نـــەزری کـــوردی کـــرد

# هەر لە بیرمە

کــەسێ بــۆ هــەژار زبــر و دڵ ڕەق بــێ
تــوشی قــەرقەش و چــەپلاخە و شــەق بــێ
دو قــۆڵی قــەوی پــڕ قــەوەت و هــێز
وەخــتێ شیــاون بــێنە ریــزی ڕێــز
بــڕبڕەی پشــتی خــێڵی بــێ زۆر بــن
لەگــەڵ تــەرانــەی خــەمی گــەل جــۆرین
دڵــی بــێ هــێزێ پــڕ مــەکــە لە دەرد
تــا پــاییزی خــەم ڕەنگت نــەکــا زەرد
کــێ پشت و پەنــای خــاس و خــراوە
بــە گەرمــای کــەرەم دڵــی سوتــاوە
لە بــیرم نــاچێ نــاڵەی دەروێشــێ
دڵ پــڕ لە ئــەوین، خــەستە و دڵــڕێشێ
بــە شــین و گریــان جــەزبەو مونــاجات
دەیکــوت ئــەی خــودای هــەستی وکــاینات
خــراو چــاوەڕێی لوتــف و کــەرەمە
خــاس بــە خــاسی خــۆی خــاتری جــەمە
(ولاتــقنطوا) بــۆ تــاوان بــارە
بــێ تــاوان بــۆ خــۆی بــەختی بــێدارە

# مانای ژیان

ئــاقڵ ئــەوەیە لە ڕۆژی جــەنگا
نــەمێنێ لە نــێو مــاڵی دەرەنگــا
وەکــو ڕومــەتی ڕونــاکــی ئــاوەنگ
بــا بــریقەی بــێ شــمشێری بــۆ جــەنگ
چــونکی لێــرەدامــردن لە گــەڵ ژیــن
تــێکەڵن بــە یــەك بــێ مــەرز و پــەرژین
هــەروا لە ڕۆژی ئــاشتی و سەفــا دا
ســیپەلك و ورگــی شــەڕ دەبــێ دادا
لەنگــەری پــاپۆڕ شــەڕ و شــۆڕ داخــا
لوتــی ڕق و قــین بــنێ بــە داخــا
تــەندوری دڵــی ســاردۆ بــو داخــا
بــا کــەم هــەڵچۆقێ لە داخــی داخــا
فــەڕشی نــەخشینی بــرایــی ڕاخــا
بــۆ کــوشتنی شــەڕ هەڵکــا بــە شــاخا
ژیــان بــە مــانای خــۆشەویستییە
وێــڕای خــۆشویستن ژیــواریٚ نــییە
بــە تــایبەت ئــاشتی لە دوای شــەڕ و شــۆڕ
شــیرینی هــەنگوین ســەد جــار ئــەدا بــۆڕ
ئــەڵێن خــۆشویستن لە دوای شــەڕ و قــین
«شــیرینترێکە لە هــەڵوای شــیرین»

«عومەر» لەو هەموە شەهد و شەکراوە
تا ئێستێ دەمی لە هیچ نەداوە

## سێ ڕا دو شەش

بەشی هەر کەسێ ڕۆژی دروس بون
پێی دەگەیێنن بە بێ چەند و چون

بنوسی بەشکەر چی نوسیبێ بوت
زۆر بێ یا خۆکەم، دەکرێتە ئەستوت

تاڵ بێ یا شیرین دەبێ بیچێژی
ژەهری ماریش بێ ناوێ بیرێژی

دنیا بە تەختەی نەردێن دەمێنێ
یەك دەیباتەوە یەك دەیدۆڕێنێ

کەسێ کە مۆرەی بەختی هێنا ماڵ
ڕەقیب ناگا پێی بە سێ ڕا جوت خاڵ

دانەر سێ کەڕەت دوشەشی دەوێ
ئەمەش بە هەڵکەوت مەگەر هەڵکەوێ

ناڵێم کە یاسای جەبری ڕەوایە
تەلاش و هەوڵی خوت بەکار نایە

دەڵێم تەماتە ژور بێ لە ژینا
خۆشی تەماتە لەتێکۆشینا

کەسێ نەکۆشێ سەرکز و ماتە
شاکە نەبزوێ بە کیشێ ماتە
ئەسپێ لەغاوی نەبێ لەزارا
پاییزیش تیرە وەك لەبەهارا
دیانەکە نە یەهێشت، دیان بەکارێن
ئەو هەربێ بەشە با سەد بەهار بێن
لەم باسە گوڵیل دەرناچێ سەری
هەروا سەرسەری ئەداتە بەری

## خراو چاکۆکە

بە وەستای چینی فەرمو فەرەیدون
کە نەخشی جوان جوان لە خێوەت بدرون
ئەو دەستوری دا بۆ هەوەڵین جار
قەراخی خێوەت کرا زەڕنیگار
بڕێ تر دەڵێن جەمشید لە بن چاخ
لیباسی نەخشاند وەکو گوڵی باخ
یا ئەنگوسیلە بە دەس چەپ کردن
ئەو کردی بە باو لەبنچاخ، بن
پرسیاریان لێ کرد هۆی ئەم کارە چین
خۆ راس شیاوی زێوەر و جوانین

گوتی بە راستی، رازاوەتۆ راس
خێر بە دەوڵەمەن دیارە کە خەتاس
خراو چاکۆکە ئەی کاکی ئاقڵ
چاك بۆ خۆی چاکە لە سەر باری دڵ
بە جۆرێ تریش ئەم نیکتە جوانە
لە بڕێ شوێنا لە سەر زمانە
وتیان بە پیاوێ گەورە و دەورە دیو
کە ئەی شارەزای هەوراز و نەشیو
بۆچ ئەنگوسیلە بۆ چەپ زێوەرە
بێ وەرە، فەرمو راس بۆ بێوەرە
فەرموی بێ بەشە گەورە لەو بەشە
کە ئێمەی بچوك دڵمان پێی گەشە
دەستی کە نێوی راستی پێوۆ بێ
نابێ کە شکۆی بە هۆی زێوۆ بێ
نێوی گەورەیی بەشە بۆ گەورە
رونە رۆن چەوری ناوێ خۆی چەورە
کەسێ کە ماڵ و کەماڵی خولقاند
هەر یەکێکیانی لە شتێکا چاند
یا هونەر دەدا لە گەڵ خەم و دەرد
یا بێ هونەری و تەلای سور و زەرد
بە دوسێ شێعرێ بێچارە عومەر
خۆی حەسێو ئەکا بە ئەهلی هونەر

## مۆژگاری شاهان

ئەبێ پەن بێژی گرۆی زۆرداران
دڵی نەترسێ لە تیرە باران
بە تەماش نەبێ زێڕی بدەنێ
ددانی تەماح دەبێ هەڵکەنێ
کەسێ مەبەستی ڕەزای یەزدانە
خەلات و کوشتن لە لای یەکسانە
نە لە خەڵات و بەرات ئەپرسێ
نە لە هەڕەشە و کوشتن دەترسێ
هیوا نەبون و نەترسین لە کەس
بنچاخی یەکتا پەرستییە و بەس

## دەفتەری قازی

مەبەس لە بونی ڕێبەر و گەورە
دەفعی زاڵمی زەمانە و دەورە
بونی مەحکەمەی حاکمیش ڕونە
بۆ تیا بردنی چەتە و چەتونە
دەفتەری قازیش وەکو زانراوە
بۆ حەق و حەسێو خەڵکی دانراوە

وەلێ هەر گەلێ ئەقڵ و هونەری
بو بە حاکم و قازی و رێبەری
لەو گەلە هەلێ نیە بۆ زاڵم
ئاش بەتاڵ ئەکا مەحکەمەی حاکم
دوکەس تاکاتێ بە حەق رازی بن
ناحەقی ناکەن تا لای قازی چن
کەسێ کەمەندی حەقی بو لە مل
لە بەندیخانەی حاکم دورە و کل
وەختێ دەزانی حەقێ لە لاتە
بێ شەڕ ئەدای کە شەڕ ئیشی لاتە
کەسێ کە خەرجی حەقی لە مل بێ
دەبێ بۆ دانی رەق نەبێ شل بێ
لەبەر خاتر حەق ملی پێداکات
با قازی بە زۆر نەیکاتە سێ قات
هیچێ دانی حەق هالۆ ناکاتۆ
دیمەنی جوانی کالۆ ناکاتۆ
بەلاّمێ قازی بە نەختێ بەرتیل
ورچێ دەکاتە قەشمەرە و نەشمیل
سی و دو ددانی کوڵە و کوڵەوار
کوڵ دەچەوسێنێ بۆ رەزای شاخار
تەنیا بە ترشی ددانی خەلکی
هاڵ دەبێتەوە ، نامێنێ کەلکی

وەلێ دانـــی ئـــەو ئەوکـــاتە هـــاڵە
کـــە زاری بـــە تـــام شـــیرینی لاڵـــە
هـــەر بـــە بـــەرتیلی تـــاقە خەیـــارێ
ســـابت دەکـــا بـــۆت کـــاڵە کـــە زارێ
بـــەس بـــڵێ «کـــۆلیل»، قـــازی قـــازییە
تـــاقە تـــۆ نـــەبێ هـــەموی رازیـــیە

## نۆبەی تۆبە

ژنـــی خـــۆ فـــرۆش لە فـــەسڵی پـــیری
وەخـــتێ مـــوشتەری نـــەکـــەوتە گـــیری
خـــەزانـــی پـــیری کـــە دای لە بـــاخی
لە بـــن هەڵکەنیـــا بـــێخی دەمـــاخی
چـــون کڕیـــارێکی نـــیە ئەمجـــارە
نـــۆبەی تـــۆبەیە چـــاری نـــاچارە
یـــا مـــوچە خـــۆرێ مـــوچەی لێ بـــڕا
قـــڕ کـــەوتە مـــڕەی، لە قـــات و قـــڕا
چـــون دەســـتی نـــاچێ بـــۆ شـــۆڕ و شـــەڕێ
ئـــاشی ئـــاژاوەی ئـــیتر نـــاگـــەڕێ
کـــە ورد و خـــاش بـــو بـــاڵی فـــڕینی
شکیـــا دەنـــدوك و پـــوکی قـــڕینی

دەس کـولْ دەکـاتۆ لە ئـازاری گـەل
کنـارە دەگـریْ وەك بـەرازی شـەل
مـەبەس ئـەوەیە کـاتی زۆر و هـیْز
بـۆ ئـازاری کـەس نـەچیتە پـاریْز
شـیْری ریْگـەیە ئـەو شـۆرە لاوە
کـە لە گـەنجی دا هـەلْنە خلْەتـاوە
دوری لە گونـاح لە کـاتی لاوی
وەخـتیْ وەك گۆچـان دانەچەمـاوی
هـونەرە، ئەینـا لە فـەسلْی پـیری
لە سـوچی مـالْ دا شـەل و پـاگـیری
دوری بـۆ لاوان لە کـرداری پـیس
پـیْویستە نـەك بـۆ پـیری لەر و سـیس
پـیری پـیلان و پـیرانـی مـردن
دەرفـەتی نـادەن بـۆ گونـاح کـردن
لەم عـەسرە کـۆلیل جـوانـیش هـەر پـیرە
لاو پـتر لە پـیر مـات و دلْگـیرە

## بوکی سەوزە پۆش

وتیـان بـە پیـاویْ زانـای زەمـانە
بـۆچی لە نـیْو ئـەم هـەمو دارانـە

تـــاقە داری ســـەوڵ نـــێوی ئـــازادە
خـــۆ ئـــەو لە کـــۆڕپەی مـــیوە نـــاشادە
شـــای بـــاڵابەرزان بـــوکی ســـەوزە پـــۆش
دیـــمەنی جـــوانـــی و، بـــێ خـــەوش و، روخـــۆش
نـــێوی ئـــازادی بـــۆچ لـــێ نـــراوە
بـــە بـــیری ئـــێوە چـــی وا لەم نـــاوە؟
فـــەرموی هـــەر داری ئـــێوە ئـــەیبینن
دەمـــێ بـــە کـــەیفن دەمـــێ خـــەمینن
دەمـــێ خـــاوەنی کـــۆڕپە و منـــاڵن
دەمـــێ بـــۆ مـــەرگی کـــۆڕپە دەنـــاڵن
بەهـــار و هـــاوین خـــاوەن لق و پـــۆن
خـــەزان و زستـــان رو زەرد و بـــێ بـــۆن
بـــە تـــریفەی مـــانگی بەهـــار ســـەرخـــۆشن
بـــە ســـرتەی ســـروەی زستـــان رەشـــپۆشن
وەلێ داری ســـەوڵ دەمـــدەمی نـــیە
چـــونکی یـــەك رەنگـــە پـــەس خـــەمی نـــیە
بـــە بـــون و نـــەبون هـــەر دو دڵـــخۆشە
بـــۆیە هـــەمیشە ســـەوز و تـــەڕ پـــۆشە
بـــە کـــۆسپی نـــەبون چـــون نـــەمردووە
ئـــاسکی ئـــازادی شکـــار کـــردووە
تـــۆش کـــە پـــێت خـــۆشە ســـەربەخۆ بـــژیت
سەبـــارەت بـــە خـــەم بـــۆ نـــەبون، دژیت

گەلێ لەم دنیا بە بەغدا شاد بون
بەغدا هەر ماوەکەچی ئەوان چون
خەلیفە رۆیی دەجلە هەر هەیە
خوا خۆی دەزانێ دەجلە تاکەیە
شازەگی ژیان هەڵبەست و پەخشان
گۆنای قاقەزی کە بە خوێن نەخشان
نوسیان هەتا هەتاوی ژیان
هەڵدێ لە روتا ئەی رۆڵەی ئینسان
یا وەك دار خورما بەخشنە و جوامێر
زکی هەژار و برسی بکە تێر
یا کەشك نابەی میوەی مەزە خۆش
ئازاد بە وەکو سەوڵی سەوزە پۆش
خۆزگە رۆژێکیش دەمبینی بە چاو
ئازادی «کۆلیل» وەك سەوڵی خۆش ناو

## دوکەس

دوکەس بە داخۆ دەمرن کە مردن
چون بێ ئاکامن لە چی کۆکردن
یەکەم بەخێلێ کە نەیخوارد و بوی
هەموی حەسرەتە ژینی رابردوی

دوهـــەم زانـــایێ بـــێ خـــێر و عـــەمەل
رۆژی تـــاریکە لە رۆژی ئـــەجەل
کـــێ لە بـــیری دێ لە مـــرۆڤی خـــێڵ
بـــە رێـــزێ رێـــزی نـــایێ لە بـــەخێڵ
کـــی نـــەیدی ســـەخی لێـــفەی ئیحســـانی
دای نـــەپۆشییێ هـــەزار تـــاوانـــی
ئـــەوەندەی هـــیوای وردی دڵـــداری
ئـــەوەندەی هـــەستی بـــەرز و ســـاکـــاری
سپـــاس بـــۆ یـــەزدان کـــە ئـــەم پـــەرتوکە
جـــوانـــە، وەك ئـــەشكی، ســـەرکـــوڵمی بـوکە
رۆژی دوشـــەممە لە مـــانگی گـــوڵان
لە دیـــوانـــدەرەی شـــاری نـــێو دڵان
ســـاڵی شـــەست و ســـێ لە چـــاوی پـــێنوس
تکیـــا ســـەرگۆنـــای وەك زێـــوی لێـــنوس

دیواندەرە ١٣٦٣

# باوانەکەم باوانەکەم

لە کوڕوکی خوێن و ڕەگما خرمەی بارانی فەڕوپیت
دێتە بەرگوێیم
لە سەر فەرشی باڵی فریشتەی پاکیدا دێم و، دەچم و،
بۆ یار دەدوێیم
پەڕە سیلکە تازە پەڕەوازەکانم بە سەوزە پەڕ، تیمـار
دەکەن زامی بە سوێیم
ئەمشەو تاسە بە تاشای دڵ خاڵی لاڵی لێوی خەیاڵ بە
گوڵی ماچی ئارەزو
دەکەن بە بووك
باڵ دەخشێنن، بە سەر هێلکەی تۆقلەکانی دەرونمدا
کۆترە باریکەی ئێسک سوک
ئەمشەو وەکو پەری خـەونی کـوژرا و گیـانی ژیـانی
دەزێتە لەش
دەگەشێتۆ وەک گوڵی گەش
شاگەشکەی شەپۆلی خۆزگا
گلێنەی دڵی تەماشا
بۆ بەژنی فەسڵی بەهاری ئازیز دەگرێتەوە باوەش
ئەمشەو ئەستێرەی بەر بەیان
پرپرە و پولەکەی ئاسمان
لە پۆپەی داری طوبی دا، چاو لە شەویۆی لوتکـەی

ئەمەل دەقرتێنن
قەناری و قومری ووتووێژ لە هێلانەی قوڵی هەوڵی
هاوڵەی هەناسەکانما
زریوەی شادی بەگوێ سروە ئەسرتێنن
ئەمشەو ملی دژایەتی لە رەشماڵی دڵداریما دەخنکێنم
دەیکەم بە پەتی هەڵبەستا
شوشەی پڕ لە عەتری شەوبوی، زەماوەنی برایەتی
دەڕژێنمە دەستی هەستا
ئەمشەو بە ئاوی یادگار رومەتی مۆنی نامۆیی
دەشۆمەوە. لەو خالآنەی وا ناحەزن
دەسوتێنم دەمی ئەوەی بڵێ مەلەک
بۆ تەماشای بەژنی ئەوین. لە سەر عەرشدا، نابەزن،
دانابەزن
تاکو ئەو شەو وتووێژی وشکی لێوی نگای شانکزو
مل کەچم
نوقمی زەریای تارمائی بوو
هاواری دەردی ترنجا و لە ناخی تەنگی مێژوودا
دوعا و نزای نەزاو، توشی نازایی بوو.
بەڵام ئەمشەو رۆحی مەعدوومێکی زیندو
ئاوی ژینی ئاژین کرد لە باخچەی هونەر
ملوانکەی خەرمانەی لە مل مانگ دەرهێنا و، گێڕای
بەجەغزی نەفەسی سیحری سەحەر

ئەمڕامنیش سامم شکا، زوانم بەر بوو
لەگەڵ شۆڕە سواری شەقڵی شەو شکێنا
بە شەرمۆکەوتمە گفتوگۆ
پێم وت ئەی هاوشانی شکۆ:
سا چونکە لە ناو باڵەخانەکەی چەما، واتە جێ
دیوانەکەی تۆ
بەرزە لە باڵی پەپولەی شابەیتەکانت، بۆی بۆسۆ
وە لە تۆ تۆێ زێری باڵیان نییە تۆوی بۆ من تۆ بۆ؟!
ئەدەم بەڵێن هەتا ماوم وەکو دەڵێن
هۆنراوە نەکەم بە ناڵی ئەسپی سوڵتان
یا بۆ سۆیلەکەی بەقەیتان
دەبم بە شاگردی ئێوەو دەیکەم بە ئایەتی قورئان
دەیکەم بە چەکی گیان کێشان
مێش دەگرم لە نیشانەی سەر تەپڵی دڵی دێوی شەیتان
ناڵە ناڵی شەوانەتم لە واژەکانت بیستوە
بۆیەکانی بە ئەو پەڕی ئاواتەوە حەزم دەکرد نەی
بیوایەم
تۆمارگەی حەی حەی بیوایەم
گۆرانی وەی وەی بیوایەم
نەشئەی نۆشی ئوخەی ئوخەی
لە بەر نێشی، حەی بیوایەم
حەزم ئەکرد هەموگیانم هەرگۆی بوایە

ڕێژنەی بارانە پاکەکەی موناجاتی شەوانەتی
چەشنی لمی لێوی کەویر هەڵلوشایە
حەزم دەکرد لەم دونیادا وەکو تۆ بم
دەس بە ئەژنۆی سەرگڵکۆ بم
دڵ بنێژم لەگەڵ لەیلاو، کەچی هێشتا دەم بەگۆ بم
حەزە دەکرد دڵم ماڵە ڕەشایی بێ و، کزی‌نشینی گوڵ
نەکاو
هەرگیز چاو نەبڕێ لە ئاوەنگ
لە سەر حەسیری پەراسوی خۆی بخەوێ با ژیانی بە
منەتی گوڵ، نەبێ تەنگ
چون چاوەڕوانی سەرچاوەن شەت و ڕووبار، پێم
خۆش نییە جۆگەو چەم بم.
دەمێ موچەخۆری شین‌و
کاتێ سورو
بەینێ ڕەش و ساتێ ئەوو جارێ ئەم بم
حەدم نەبێ خۆتاسایی پێم خۆش نییە قرت و چەو بم
سەرەڕەو بم
نۆکەری خواردن و خەو بم
قەڵەمەکەم بەم بە سەلەم خۆمیش لە ڕەهن وگرەو بم
دەمەوێ کانی و ئاوێکی پڕ لە هیوای زۆر وکەم بم
لانی کەم چەشنی زەمزەم بم
بم‌کەنە نێو شوشەی نەجات

لە سەر کڵی دڵی عەشقا، چاتر لە عەترو بۆی بەهار،
تازەدەم بم
لە گەڵ خۆما زۆران بگرم، هەر چنگاوشی خۆم و،
پێخەم بم
پشتی نەوسم بدەم لە خاک
یەک خەم کەمە، پێم خۆشە بۆ خەم دوخەم بم
پێم خۆشە نییە کوشتەی خاڵی لێوی ئاڵی زینی مەم بم
یا عەودالی ئاوی ژینی چاڵی چەنەی شیرینێکی
شەکەر دەم بم
وە یا ناڵە ناڵی بێژەن لە نێو چای تاریک و قوڵا
بۆ سێوی لێوی مەنیژە و بۆ زەبری دەستی رۆستەم بم
تەنانەت نامەوێ مانگی یەك شەوە بم،
لە حاستی خۆر کڕنوش بەرم و، کەوان ئاسا کۆم و
چەم بم
قەت ئاواتم نەخواستوە ببمە شەونم
گوڵ بم کاتە عەینەکی چاو، لە سەر چەم بم، لەبەر چەم
بم
من کە دڵم عەرشی خوا بێ قەدرم دەشکێ، گەر حەز
بکەم جامی جەم بم
لە رۆژێکۆ راست و چەپی خۆم دەناسم
حەز دە کەم دەستی عیسا بم. حەز دە کەم گوڵی مەریەم
بم

ئەی کوڵەکە زێڕینەکەی بارانی خەستی ئاسمانی
سەوزەڵە
ئەی عەقیدە مەرزیەکەت شانەی پرچی کیژی
کازیوەی حەوسەڵە
بێتو دڵم ساڵێ، مانگێ، یا حەفتەیێ، ڕۆژێ، شەوێ
دەقیقەیێ، سانیەیێ، کەمتر لەوەش
خەیاڵاوی لە شوێنت شوێنی نەکەوێ
چەقۆی قاری لێ تیژ دەکەم، سەری دەبڕم، وەک
چۆلەکەو، زڕەکەوێ
بێتو لە تۆ جیا ببنەوە شیعرەکانم
وشک وزڕو، گێژو وڕو، شەق و شڕو، مات وکڕن
بۆ بوکی بیر نابن بەگوڵ وگوارە و مێخەک
ناشیرینن، ڕویان نییە سەر هەڵبڕن
ناشیرینی هەڵنابڕن
ئەگەر بێتو دەستم نەگری و،
نەڕژێتە ناو دارستانی باوەڕو زەین و خەیاڵم،
نەتکیتە ناوگەروی تامەزرۆی تەشییهم،
لەگردنی ئاسکی ناسکی باسکی جوانی راوبەتاڵم
خەم وە ئەبرۆ ناخەم ئەگەر چی لە دنیای چارەنوسما
قات و قڕ بێ
لە نێو سینەم
هەورو هەڵای برین تەمی نەڕەوێتۆ و، گوڵی گرین

دڵی پڕ بێ
جا بە تاو
هەڵچۆڕێتە سەر مەزرا و مەزرەعەی مەزاری گوڵە
عەنبەر و خاتوونا
راکێشن رەگی حەیاتم وەشوین هەتیتەی حەسرەتا
ملی دڵم کەنە پەتا
تا وێنەی تۆ خۆم پەیا کەم لە توناوتونی نەبونا
باکم نیە غەریبێ بم لە هەندەران
هیچ ماڵێ شەو رێم پێ نەدا و، بنوم لە مزگەوتی دێدا
بەو مەرجەی بۆی کزەی جەرگی پیرێکی پەسەک لە
بەری بێ تێدا
بە درێژایی مێژوو وەکو دارگوێزەکانی هەورامان
رابوەستم ببمە کێشکچی تا هەرمان، بێ پشودان
هەر وەک خەڵات کراییتم وایە، ئەگەر
بشنێمەوە بۆ سڕینی عارەقی سەرگۆناکانت
گەڵاکانم حاڵیان لێ بێ
بە چریکەی سیاچەمانەکەی باخی ناخی پڕ لە عەترو
بۆی عیرفانت
تۆ ئەوگەنجەی وا لە سەردەمی گەنجی دا
دەچوی بە گژ داری سەروا
سوکتر لە رۆح بە ئاسانی،
بۆچی؟! بۆ دەرهێنانی هێلانەی مەلی هەتاو

بۆ گرتنی پێچوە نوروگرشەکانی
پۆل پۆل لەو پێچوانەت ئەوەن دەستەڵێن کرد
لە بەڕوکو باخەڵەتا
هەتا، هەتاو، خۆیشی لە سەر سینگت رواو،
لە ئاسۆی لێوتەوە هەڵات
بەرق بۆ بابا خەڵەتا
ئەی هەر لەدین دروس کراو
گیانم گراوی گرینە، چەشنی کەواو،
کاتێ ئاگر پێکەنێ بۆی
بە فرمێسک کڵوکۆم دائەمرکێنم،
رازی بەینی خۆمو خەفەت نادرکێنم
قافڵە سالاری ئەم، کاروانە چونکا تۆی
لەو کاتەوە مەحرەمەکەی موحەررەمت
لە حەرەمو، خەڵوەتخانەی، تەنیایی‌دا ون کردوە
لەو کاتەوە ئەڵقەی خولامی پەژارە و مەرارەتت
لە گەردنی من کردوە
بۆیە کانێ
لە ژێر چاوەدێری خەمام و، کەس ناتوانێ هاتوچۆی
ئازارم لێ قەدەغەن کا.
ئاخر بازاڕی ئازاریش هەر ئەوەیە، عاشقی شینی
شاعیرانە و
پیی خۆشە بۆ خۆی شیوەن کا

لێم ئاێینه تا مانگ و ڕۆژ هەڵدووراون بە سەر
سوخمەی عاسمانانا
تا دڵۆپێ شیر بمێنێ لە ناو گوانی کاکێشانا
تاگوارەی ئەستێرە شۆڕە لە گوێچکەی حەوتەوانانا
تا ڕۆژێ پەرچەمی پەخشو پەڕیشانە، بە سەر شانا،
ریشە و مانا
تا شیعرێ چاوی دادە گرێ، لە بەژنی زامێکی بەسۆی،
سەرۆکایی بە ئازارە لە جەرگەی تیمە ومانانا.
بۆیە کانێ هەر شاعیرێ پەیکەرەسازی ئازارە لەوشەی
جوان
چونکا کەسێکێ تر وەکو ئازار و غەم شیعری نەدوان
لە هەندەرانیشا هەر ئەو بۆی هاتە ژوان،
لە بۆ هەموان، نەک یەک و دوان
بۆیە دوگوێی ئیتا عەتم گرمەگرمی هەوری ئازار
ئەخواتەوە
چون هەر ئەو لە بەر ئاوێنەی ئەسرینمدا
خۆی دەق ئەدا و، سەرو زوڵفی ئەشواتەوە
بۆیە کانێ بە برژانگی چاوەکانم، پرچی ئازار شانە
ئەکەم، باوانە کەم.
ئاخر کەسێکی تر نییە لە سەر سینگم هێلانە کات،
باوانە کەم
ئاخر کەسێکی تر نییە دەرکی دڵی بۆ شاعیرێ بکاتەوە،

لانی کەم شیعرە کانیٚ شارەودەر نە کا
تەقەی کینە و خەتر نە کا،
ئاوری وسکوت نەداتەوەو، پەیکوڵ لە بەر پای
هەڵبەستا، لەمەر نە کا
ئەی قاموسی پڕ لەوشەی بە ناموسی حەیا و شەرم
پەڵە هەوری رەستە کانت، تا دائە کەن بە سەر پێسانی
بیرما، نەرم نەرم
دەستی دەشتی مێشک و سەرم
پڕ لە لێمۆی زەردو شەمامەی خەت خەتیو بۆن دار
ئەبیٚ
لێمویێ کە بۆ پێشکەشی دڵدار ئەبیٚ،
شەمامەێی کە بۆ سەر خەرمانو جەزی بڕیار ئەبیٚ
وەلیٚ تا لە بڕکە کانی دەیکەنێمۆ
تاقمی مونتاژگەرە کان، لێمی دە کەن بە گڕکەی بڵ
لێمیٚ دە کەن بە کاڵە کە مارانە، پێستی شلٚ،
لێمیٚ دە کەن بە تەماتەی سەرما بردو، بە کەلای گلٚ
وەلحاسلٚ، لێمیٚ دە کەنە، ژانە زکو دەردی سپلٚ
لێمیٚ دە کەن بە چڵەی چاوی شەوارە کردوی
ئێشوچلٚ
منیش تەمرینی تۆڵە کردنەوەم نە کردوە
سەرم هەوای تێدا نییە بۆ قین و قار، بۆ گیرودار
ئە ینا دلٚ شکاوان دەڵێن

دڵێ کە بو بەدولە تۆ
بۆ دەرهاوردنی دەمار، تیژترێکە لە زلفەقار
ئەی ئەستێرە روناکەکەی بەر بەیانانی سنوری دین و
ئیمان
ئاشناکانی ئەم دەمە بۆنی غەریبەیان لێ دێ، ناشناتر
لە ناشنان
بو بە هەرێز بنجی کوتا لە خوێنما، داخی عاشقەکانی
ئەم دەمە
قاژەرەشە دمەلاسکێی کۆتری حەرەم دەکاتەوە
بەرزە هەرای گمەگمی گاڵتەوگەمە
ئەوین ئەمرۆ چاوە چاوی بۆ پارەیە بۆ ماشێنە بۆ تالارە
بۆ کچێکی مۆد پەرستی خوڵە رەنگا هەڵژەندوە، بۆ
نەیارە بۆ لاسارە
لە لاێیکۆ لە نێوانی ئەو دو عەشقە دژویەدا
وشەی جوانی جوان پێ شێل ئەبن
ئەلۆ ئەلوکانی پشتی تەلەیفونی هەوەس پاکیان
چاو خێل ئەبن
باش تر بلێم
دیدەی مەستی هۆنراوەکان پڕ لە خوڵی گریان ئەبێ
بریانە بێ
زوانی پاڕانەوەی دەشکێ
قسەی ناخی چوڕاوی دێ، مەگەر خوزگە و بریا، نەبێ

لە لایێکی تریشەوە
ئێستە کانێ کەسانێ هەن، رێ بە کاروانی هەڵبەست و
شیعر دەگرن
باج ئەستێنن
زۆرێکیان لێ شەهید ئەکەن
ئیتر مۆری خۆیان بە زۆر بە ناسنامەی ماباقیدا
ئەچەسپێنن
مانگە شەوی کرجوکاڵی قەسیدەیێ یا غەزەلێ
پێتو هەڵێ
دەمبەدەمێ، لە قەڵەمێ
یا لە کەلی دەمێ چەلێ
گەلێ بە فێڵ و فەرەزۆ،
لێی دەچنە حەلی حەلێ
ئەیانەوێ کە پەریە سپیلکەکەی مانگ
لە نێو دەریای شین و مەنگا وەدەربێنن
رەنگی هەش و بەرگی رەشی کافر بونی کەنە بەرداو
لە حەوزی لیخنی کوفرا بی خنکێنن
ئەمانە بەم خەیالانە
پڕ و پوچ وبە تالانە
ماسی فێرە مەلە دەکەن
دەیانەوی شیعر ژورو نوری نەبێ
بەلام دیارە کوێر کوێرانە لەپە کوتێ و پەلە دەکەن

ئەیانەوێ وەک چۆلەکە
ڕۆژی ملی هەزار هەزار مەلی هۆنراوەی بەرزەفڕ
هەڵبکێشن
چرای هەڵبوی چاوەکانی هەڵبکوڵن
بە شاییێنی خۆیان هەرچەن سەریش بکا
وەزن و کێشی بۆ بکێشن
ئەوا ئێستا چەشنی دەستی چەوساوەکان
چەوساوەنە حەساوەکان
دەستی دڵم قڵیشاوە
ژانی قینی لێ دەچۆڕێ لە داخی ئەم زێگرانە
ئەم چەتانەی دەخڵ و دانە و، ئەم چەتانە
لە سەد لاوە
بەم بۆنەوە بەڵێن ئەدەم
عومر ئەگەر مۆڵەت بداو، بە هاژیکی دی بێتەوە
بەفر لە سەر دڵی گوڵی دەشت و دەمەن، بتوێتەوەو
بچێتەوە
کەندو لەندو، دەشت و چیای وڵاتەکەم ، هەمو لاێی
دەپشکنم
چی وەردی بێ گەردی لێ بێ بۆ خەڵکی شارەکەم
سەقز هەڵدەچنم
هاتو گوڵم دەس نەکەوێ ئیتر لە تەپۆڵکەی سەرما
باجێ نەمێنم لە خێرا

خێرا دوچاوم دەردێنم
ئاخر من شاعرێکی بێ ناو نیشانم بەم کارە ناوم
دەردێنم
ئەمجارە مێژوو دەنوسێ
لە کونگەرەی مەولەویدا شاعرێ بو کزو کۆلیل
چرای چاوی لە سەر دەستی راگرتبو
بۆ رێزی خەڵکی شارەکەی
نەبۆ بەرتیل

سەقز مانگی خەرمانانی ساڵی ١٣٧١ هەتاوی
بە بۆنەی کونگەرەی مەولەوی کوردەوە.

# فەرهەنگۆك

ئامیان - هەوێن
بان - سەر، ژور
باو - باوك
بایە قوش - بو، كوندەبو
بڕوەن - بڕبەند
بژنەوە - ببیە
بنچاخ - قەباڵە، بەڵگە
بەتانە - زاموسكە
بەردەزێژە - بەردەپێ
بێوەری - بێ بەری، بێ بەش
بیقوژێنەرۆ - بیكوژێنەوە
پواز - هۆرە
پوت ۱ـ بەتاڵ ۲ـ چەلەنگ، دەفری بە تەنەكە.
پوكاوڵ - چەمۆڵە
پێ پەتی - پێ خاوس
پێوەدایین - پێوەدان
تاخان - هەوەڵ خانەی تەختەنەردكە جوت
مۆرەی لێ دائەنرێ
تاو - لێزمە
تمیشا - تەماشا
تون - توند
تەوێڵ - توێڵ، ناوچاوان
جوێن - جنێو
جەحانم - دۆژە، «جهنّم»
جەمۆكردن - وەكۆكردن
جی تێڵێ - بە جێ دێڵێ
چاكۆكە - چاك بكەوە

چاوانە - کانگا، چاڵاو
چاو چۆ - چڵێس، چاو برسی
چت - شت
چل و چۆ - دوزمانی / سخن چینی
چەپلاخە - شەپلاخە زللە
چەپەڵ - پیس
چەرمو - سپی
چەق - سەر سەخت و لاسار
خۆ خلاوێنەر - خۆ خافڵێنەر
خوڵتە - کلکە سوتە
دوران - درون. دورانی لێوم = لێوی دروم.
را- جار، کەڕەت
زگار- زویر، خەفەتبار
زوخ - زوخاو
ژەنیا - داخرا. ژەنین = داخستن.
ژیوار - بژیو
سپلۆت - سپلۆ، سەگ
سوچ - سود
سەبون - بای گەرم
سەرپل ١ـ گێل ٢ـ لە سەرپێ، ئامادە ـ وەك لە سەر پێ بونی دەمانچە
سەرەتەچێ - سەرەتەقێ
سەندن - وەرگرتن
سیراج - شیرێژ
قاو - دەنگ، هەرا
قول - لە ئەژنۆ بەرەو خواری گیاندارخاڵ
کاڵەکە ماران - گیایەکی دێمی یە دو جۆری هەیە
یەکێکیان وەك مێو تەرز ئەهاوێ
و بەرێکی خڕ ئەگرێ و ئەخورێ
ئەوی تریان بەرەکەی وەك شوتی و
کولەکە وایە و، زۆر تاڵە پێی

ئەڵێن "کوژاڵك" ـ خاڵ ـ
کل - کەنار، قەراغ
کۆڵە ١) کۆلو، نانی لۆچی ناو تەنور ٢) سوتەمەنی
کۆڵانەوە - بە چاو دادانەوە
کورۆك - نێرك، کاکڵە
کوژاڵك - کاڵە کە ماران
کوڵ - کورت
کەژە کیفە - کەژو، برش
کە کرە - جۆرە گیایە کی کێوی زۆر تاڵە ـ خاڵ
کەڵوە - کەڵبە، کەڵپ
کەیل - پڕ
گاڵە - قسەی بێ مانا. گاڵە کردن - قسەی پڕ و پوچ کردن. (گڕ و گاڵ)
لەم - زگ ـ خاڵ نانە لەمی، نانە زگی
نکە - ناڵەیە کی سوکە لە نەخۆشەوە دێ ـ خاڵ
هۆڕ - دەفرێکی چنراوی دولاییە لە جەواڵ گەورەترە و لە تێڕ بچوکترە ـ خاڵ ـ
هەوژگۆزە و دێزە دروس کردن